# خود.. نووسینەوە

دیدار و وتار

ئەنوەری ڕەشی عەولا



ناوی کتێب: خود.. نووسینەوە - دیدار و وتار
نووسینی: ئەنوەری ڕەشی عەولا
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٧١٨
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل + تریسکە ئەحمەد
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
بەرگ: مریەم موتەقیبیان
چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٨
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە ١٧٦ی ساڵی ٢٠٠٨ی دراوەتێ

# نیگاکانی ئاو.. نیگاکانی ئازادین

سازدانی: ئاوات حەسەن ئەمین

ئاوات: لە میانەی خوێندنەوە و گوێ لێ گرتنم لە شیعرەکانت ئەوەم لە لا دروست بوو کە شیعر لای تۆ (واتا) بە کرانەوەیە، بۆ پرسیارکردن گومان خستنە ناو یەقینەکان.. لە کاتێکدا ئەم کارە ئەنجام دەدەیت فەلسەفە ئامادەیی هەیە لات چۆن مومارەسەی ئەم حاڵەتانە دەکەیت لە شیعردا!؟

ئەنوەر: کە ماهیەتی مرۆڤ.. تایبەتیەت و ئەو کارانە بێت کە ئەنجامی دەدات ئەوانەش لە خۆیاندا فرە فۆرم بن و چییەتییان لێ وەربگرنەوە... (لە ئیختیار و ئیرادە و چەپاندن و دڵەڕاوکێ و کۆمەڵێ چەمکگەلی تری فەلسەفی و دەروونی و میتۆلۆژیش) ئەمانە بۆ خۆیان تەیفێکی فرە ڕەنگن و دەبنە زەمینەی ڕۆحی بۆ زایینە شیعرییەکە. جا وشەکانی ئەو فەزا شیعرییەش بارگاوی دەبن بەو زەمینەیەی لێوەی هاتوون و دێن. ئا لێرەوە گەر شا مەبەستی شیعر بۆ ناساندن و نزیکبوونەوەیەکی زیاتر بێت لە پانتاییە فەرامۆشکراو و نەبینراو و خەفەبوو و نەناسراوەکانی ژیان و مرۆڤ ئەوا خود نومایشە شیعرییەکە لە (نەبوونەوە) کەڵکەڵە فەلسەفییەکانیش لەگەڵ خۆیدا دەهێنێتە (بوون). جا بە شێوەی دژایەتی و هەڵوەشانەوەی بێت یاخود بە هاویەکی و هەمەڕەنگی بوون؛ بۆ تەیکردنی ڕێگەیەکی تر لە نێوان دژایەتی و هاویەکەکاندا. (بێ ئەوەی مەبەستی بێت ئەم جەنگە لەسەر حسابی دەقە شیعرییەکە تەواو بکات!) بەڵکو بۆ خاتری ئەو گومانانەیە کە نەشڵەقێنراون. کە خەون و خولیا و خەمەکانی مرۆڤیان ئیفلیج کردووە و وەک کەرەستەی خاو تێی دەڕوانن.

گەر فەلسەفەش بەمانا خەستەڵۆکەکەی (کارکردن بێت لە نەزانیندا– ڕاسل–) ئەوا لە گەشتە ڕۆحییەکانماندا، بە بەشداربوونی ئەو ئەگەرانەی دەخوازین تاقی بکەینەوە و بیسەلمێنین و بیناسین، چەند باشە فەلسەفەش قسەی خۆی بکات و داکۆکیکەر



بێت لەو فەزایەی.. کە تیایدا وجودێکی تری پێ دەبەخشێت.

ئا لەو پنتەدایە شیعر و فەلسەفە دەبنە یەک گیان و مینا ئاوەڵدووانەیەک قسەی دڵی یەکدی دەکەن. ئیتر کە شیعر شارستانییەتێک بێت ئەوا گشت ڕەگەزەکانی تریش دەکارن جێگە و ڕێگەی خۆیان هەبێت و لە زیندوویێتی و بەردەوامی ئەو شارستانییەتە شیعرییەشدا خۆشیان بپارێزن. ئەمەش ساتەوەختێ مەیسەر دەبێت کە دەستبەرداری ڕەهایی خۆیان بووبێتن و سروشتێکی سەرابی شیعرییانەیان وەرگرتبێت – واتە – شیعر کاریزمای خۆی نەک لە دەست نەدابێ بەڵکە لە خزمەت کاریزماکەشیدا بن. گەر یەقینی فەلسەفە... فەلسەفەی یەقین تەنها ڕووی لە دەرەوەی خۆی بێت (بێ ئەوەی پایە لەرزۆکەکانی خۆی ببینیبێت و ناسکردبێت ئەوجا بانگەشەی پێرفێکتی و کاملی خۆیشی بکات) ئا لەوێڕایە بینین و بۆچوونەکانی ئەو دامەزراوە بە مادیی و مەعنەوییە دەخرێتە ژێر پرسیارەوە و گومان لە بالایی و بێ گەردییەکەیان دەکرێ.

جا کە نووسینی شیعریش بە دیوێکیدا جۆرێک بێت لە خود نووسینەوە، هەر ئەو خودە خۆی لە بەردەم تۆڕی وەڵامە کۆنەکان.. بڕیارە کۆنەکان.. دڵنیایی و خەون و ستایلە کرمە ڕێزبووەکاندا ببینێتەوە.. کە هەراسانکەر و ڕێگرن لەبەر سەفەرەکانیدا.

شاعیر لە ڕێگەی پێکهاتەی جۆربەجۆرەوە (کە بارگاوین و دەرئەنجامێکیشن لە پرسیار لەسەر پرسیار و گومان لەسەر گومان، هەستی شاعیرانە و زەمینە ڕۆحییەکەی دەڕسکێ و... سێوەکەی نیوتن ئاسا بەربوونەوە لە دەست خۆیدا نامێنێ) بۆ سەر زەوی وجودێکی تر کە بە گشت ڕەهەندەکانییەوە لەو واقیعە ئێکسپایەربووە ناچێت کە تیایدا دەژی و فاکتەری نامۆبوونییەکەشیەتی. ئا لەو ڕووبەڕووبوونە نابەرانبەرەدا.. شاعیر چ سەرمایەیەکی هەیە جگە لە موبارەزە و سەماکانی وشە؟!

وشە ڕەنجەکانێتی، وشە فیکر و.. خەیاڵ و.. جیهانبینی و.. ئەرێ و نەرێکانێتی بۆ شوێنێکی تر و زەمانێکی تر – واتە – چوون بەرەو میتافیزیکیا و سوپەرناتۆراڵییەتێکی ئیستاتیکییانە؛ لەدووی سۆراخکردن و ئافەریدەکردنی کیشوەرێکی نەناسراو و بیر لێ نەکراوە و دەرک نەکراو...، کە دەبنە مۆتیڤێک بۆ ئەو

چینە نەبینراو و نازنەکراوانەی ناوەوەی شاعیر کە ئامادەییان هەیە بۆ تەقاندنەوە بە تەلیسمی وشەیەک.. دیمەنێک.. خورپەیەک دەریچەگەلێکی ئەوها دەکەونە سەر گازەرای پشت کە جلەوگیرییەکی بەبەرەکەتانەی شاعیر دەکەن بۆ تەعبیر لەو هەیەجانە ڕۆحییە گوزارشت لێ نەکراوەی.. کە کەرنەڤاڵێکی ئیستاتیکی وەها لەگەڵ خۆی دەهێنێ کە زەمینەی دیالۆگە شیعرییەکە ساناتر و بەپێزتر دەکات؛ کە سیخناخە بە کۆمەڵێ پێکهاتەی ئەقڵانی و عاتیفی و حیسی وەها کە ڕێنماییکەر و چاوساغە بۆ هاوئاهەنگی و هارمۆنیکییەتی (جەنگە)کانی.. زمانی هەست و زمانی ئاخافتن و زمانی خەیاڵ و زمانی نووسین و زمانی داڕشتن و زمانی شیعر.

بەشێوەیەک زمانی گشت ئەو زمانانە وەها ڕێک دەکەون بە ناچۆراڵییەتێکی وەها دێنە گۆ، کە زمانە ناوکۆییەکە هەر خۆیان عەرشن و پاسەوانن و قفڵ و کلیلیشن!

بەڵێ.. هەر لە پلەی سفری ئەو نووسینەدایە بەرە بەرە وشە و ڕستە و هێما و ئاماژە و ڕەمز و دەستەواژە و ئەیکونەکان بەشێوەیەکی دینامیکییانە لە ناو یەکدیدا دەپیتێن و ئاوس دەبن و دەزێن و.. مانا دەروونی و دەلالییەکان مەبەستگەرایی یاخود فەلسەفەی شاعیر لە شێوازە شیعرییەکەدا نومایش دەکەن بێ ئەوەی لە «ڕووبەرە بێ ڕووبەرەکەی تێکستە شیعرییەکەدا» شاعیر پێشوەخت بڕیاری دابێت «چێژ و.. نامە و.. جیهانبینی و.. ریتمەکان) کە وەک – یەکەیەکی ئۆرگانیکی– لەشە زیندووەکەی تێکست پێک دەهێنن» چۆن بێت و چۆن نەبێت! بەڵکو ئەوە نارسیستییەتە شیعرییەکەیە لە لابراتۆرییە – دڵڕەق و میهرەبانەکەیدا– خەسڵەت و ماهیەتی هەموو واتا و ڕەگەز و کەرەستەکانی تر بەشێوەیەک دەگۆڕێت.. کە دەنگ و ڕەنگ و بۆ و سەماکانی ئەو وەربگرن و.. بە هەست و پێستەوە لە خزمەت ستراتیژییەتە ئیستاتیکییەتەکەیدا بن و.. گشت کایە و ڕەگەزەکان هەیبەتە فەنتازییەکەی شیعر پیشان بدەنەوە و قسەکانیان لە ناو کەشوهەوای قسەکانی ئەودا – شیعر – شوناسیتر وەربگرن! بەو مانا سۆفیانەیەی (ئەقڵ خزمەتکاری دڵ و.. ئەقڵیان بۆ دڵ ئافەریدە کردبێ– ئیمام غەزالی–). ئیدی.. تا ئەو هێڵە بەیانییە تەعریف نەکراوە – نەیەتە وجود، ئەو پنتانە ناناسینەوە و نازانین کەوتوونەتە کوێی ئەو ڕووبەرانەی کە بێ ڕووبەرن و.. ئا لەوێڕایە شاعیریش تەعریفێکی تر وەردەگرێت و لە ئاستێکی تردا



دەگاتەوە بە خۆی. نەک دەقی خستبێتە ناو تەعریفێکی پێشوەختەوە.

کە پرۆسەی هاتنە دنیای شیعر بارگاوی بێت بە – نادڵنیایی– لە بەرانبەر – دڵنیایی– یەقینەکاندا (مرۆ ناچار دەکات کە هێزەکانی خۆی ئاشکرا بکات –فرۆم–) بۆ خاتری تەقاندنەوەی مانا و دەلالەتە جێگیرەکان و بەخشینی مانا و دەلالەتی تر و شێواندنی بنیاتی تاک ڕەهەند و.. تاک شێوە و.. تاک پەیامی و.. بۆ فرە ڕەهەندی و فرە شێوەیی و فرە پەیامی و فرە مانایی و فرە ئاماژە و دەلالەتەکان.

ئەم ئاوەدانکردنەوەیەش کە لە – وێران–ەکانمانەوە دەست پێ دەکات.. لەو ڕماندن و ڕامان و سەرلەنوێ بیناکردنەوانە خودی شاعیرەکەش دەگرێتەوە. ئەم خەیاڵە باڵایەش.. باڵایی خۆی لە (مەرگ و.. لەدایکبوونی بەردەوامدا) فەراهەم دەکات – واتە – گومان لەسەر خۆی و پرسیار لەسەر خۆی.. ڕوئیای تر لەسەر خۆی بەپێشمەرج و پاشمەرج دابنێت! چونکە کە وێنەی دوا خەیاڵ بوونی نەبێت کەواتە دوا گومان و دوا پرسیار و دوا ڕوئیاش وجودیان نییە هەر ئەمەشە ئەگەری کرانەوەکانی مەحاڵ! جا کە فەلسەفەش بەبارێکی تردا (بیرکردنەوە بێت لەسەر بیرکردنەوە – ڕاسڵ) ئەوا شیعر و فەلسەفە لە مەملەکەتەکانیاندا ئامادەباش دەبن بۆ ئەگەری تێکستی تر و وێنەی تر و سەفەری تر و کەڵکەڵە و هەڵکۆڵینی تر!

ئاوات: بێدەنگیت لەم ساڵانی دواییدا.. بێدەنگیت بەو واتایەی (خۆت گوتەنی:

> گەڕانەوە بۆ ژوورەکەی خۆم و خەڵوەتگای تەنیایی بە مەبەستی کارپیاچوونەوە) پیاچوونەوەی دوێنێی ڕوانینە جیهان بە چاویلکەی ئایدۆلۆژیا و ئەمڕۆی قوتاربوون لەو کارە. چی دەڵێیت لە بارەی ئەمەوە؟

ئەنوەر: وای تێ دەگەم.. مرۆڤ گەڕیدەیەکی مۆلەق و نامۆ بێت لە نێوان (باوەڕ.. بێ باوەڕی و.. گوماندا). هەر ئەم حاڵەتە ناکۆک و ناهاوسەنگانەشن کە ناچاری دەکەن لەسەر هەنگاو و.. بڕیار و.. بیرکردنەوەکانی بووەستێ و تاوتوێیان بکات و بیانخاتە ژێر پرسیارەوە، چونکە کێشەی وجودی مرۆڤ ئەوەیە بە دوای ڕێگەیەکدا هەڵوەدابێت؛ جا کە لە دەرەوەڕا نەیبینییەوە.. ئەوا ناچارە لە ناو خۆیدا بۆی بگەڕێت و لە ناخیدا کەشفی بکات یاخود ئافەریدەی بکات، کە وێ دەچێ هیچ لە ڕێگەکانی

تر نەچێت! جا کە ئایدۆلۆژیاش یەکەم ڕێگە و دوا ڕێگە بێت و.. لە تۆبۆگرافیاکەی خۆیدا بە بەڵگەنەویستەکانی: مەودا و.. ئاراستە و.. جووڵە و.. مەبەستدارییەکان سەراپاگیرانە کۆنترۆڵ بکات، ئەوا لەو نێوەدا پەنجەرەیەک نامێنێ بۆ ڕوانین و هەناسەدان! تەنها ئەو پەنجەرە موزەوەرانە نەبێت کە ئایدۆلۆژیا خستوونییەتە سەر پشت بۆ نیشاندانی کۆتایی ئەگەرەکان و پێویستی مانەوەی ئاسۆ تاقانەکەی خۆی و ناشیرینی دوژمنەکانی. – کەواتە – چوونەوە ناو ژوورەکەی ڕۆحم... بۆ هێنانە گۆی ئەو بێدەنگییە تەمەن درێژەیە کە غەوغای ئایدۆلۆژیا نەیهێشتبوو دەنگی بە هیچ جێگایەک ڕابگات و.. نەیهێشتبوو بە زمانی خۆیشی لە ماهیەت و تایبەتییەتە جیاوازەکانی بدوێ. چونکە ماڵی خود و تاک و تەنیاکان؛ ئەو ماڵانەن بەهایەکیان نییە بۆ تێرامان لە فەرهەنگی ئایدۆلۆژیادا (تاکەکان بۆ ئەو هەر تاکێکن و.. شتی یەکەم و کۆتا یەک شتن و.. جۆر بۆ ئەو مەفهومێکی نییە –نیچە–) ئایدۆلۆژیا کە بەدووی هێزەوە بێت (هێزیش لە ڕێکخراوبووندا بێت).. ئەوا دەبێ جەڵەبییانە هەموو شتەکان بنرخێنرێ. بەڵێ ویستم لە ژوورەکەمدا بە وشەگەلێکدا بچمەوە کە لە لایەن ئایدۆلۆژیستەکانەوە بۆ ئینسانی تاک و تەنیای داتاشیبوون و بە گێرەشێوێن.. کارنەکەر.. خودپەرست.. سەرلێشێواو.. بێ بەرنامە.. هەلپەرست.. زماندرێژ... تاد ناوی دەبردن! نازانم ئەو واقیعییەتەی ئایدۆلۆژیا هەمیشە دەیکاتە پێوانە بۆ ڕاستێتی خۆی؛ بێ مرۆڤ چ واقیعییەتێکە؟! لە کاتێکدا مرۆڤ خۆی واقیع و ئەودیو واقیع و بگرە واقیعی واقیعەکانە (مرۆڤ پارسەنگی هەموو شتێکە – سۆفستاییەکان–) ئایدۆلۆژیا لە کاتێکدا ترسناکییەکەی دەردەکەوێ کە هەر چی شتە بۆ خۆی لووش دەدات و.. مۆری هەقیقەتی خۆی لێ دەدات. تاکەکان لە تاکێتی ڕاستەقینەی خۆیان دادەماڵێ و بە ناوی بەرژەوەندی گشتییەوە دەیانخەسێنێ و دەیانکاتە سەرباز. ئەزموون و تێگەیشتن و لێکدانەوەی خودی خۆم ئاوام پێ دەڵێت: زەمینەکانی ئایدۆلۆژیا مینرێژ کراون و بە نۆبە دەتەقنەوە (ناتکوژێ بەمانا فیزیکییەکەی) وەلێ هەر جارەی شتێکت لێ زەوت دەکات: بیرکردنەوەت.. ئیختیارت.. سەربەخۆییت.. ماهیەتت.. دڵت.. ڕۆحت.

گشت ئەمانە تیرۆر دەکا و لەبری ئەمانە کەرەستەی تایبەتی بێ ڕۆحی خۆی تێ دەکات!! گەرچی ئایدۆلۆژیا لەبەر ماقووڵیەت و ڕەوایەتیدان بە خۆی گشت کاتێ بە



ناوی مرۆڤەوە قسە دەکات. وەلێ ئەوەی بۆ هەمیشە لەو مەملەکەتە داخراوەدا بۆ ئەبەد مرێنراوە و بێدەنگ کراوە خودی مرۆڤ خۆیەتی. خود هیچ متمانەیەکی بە خۆی نامێنێ و گشتی دەبەخشێتە ئایدۆلۆژیاکەی چونکە ئازادییەکەی دەکوژرێ. خودێکی ئازادە دەتوانێ متمانەی بە خودی خۆی هەبێت. وێ دەچێ کەسێ بپرسێ کەوابێ ئایدۆلۆژیاش بووە بە (سێوە حەرامکراوەکە) دەڵێم: نا! بەڵام کردنەوەی ئەو سێوە چەندێ پێویست بێت بە قەد بارتەقای ئەو پێویستییە گومانی دەوێ.

ئاخر (مێژووی بیرکردنەوەکان مێژووی ئایدۆلۆژیاکان نین –فۆکۆ–) هەر لەبەرئەوەیە ئایدۆلۆژیا پێ دەزانێ گومان مەحفیشی نەکاتەوە ئەوا دەکارێ پشووی لێ ببڕێ و هەراسانی بکات. هەر بۆیە ناچارە بۆ پاراستنی وەهمەکانی خۆی گومانکوژ بێت و بە دوژمنی خۆی بزانێت.

لە هەر جێیەک ئایدۆلۆژیا هەبێت.. دەبێت گومانیش بوونی هەبێت و لەسەر سەرییەوە بێت. ئەگەر نا کردنەوەی ئەو سێوە و خواردنی ترسناکیش نەبێت ئەوا ناتەندروستە! مەوفەقیەتی گومان.. خامۆشکردنی بزێوییەکانی ئایدۆلۆژیایە و مەوفەقیەتی ئایدۆلۆژیاش خامۆشکردنی گومانە!

چونکە ئایدۆلۆژیا یەکێکە لە زاروڵە خۆشەویستەکانی موتڵەقییەت.

بەڵێ دەزگاکانی ئایدۆلۆژیا (لە یەک کاتدا پاڵنانە بە ئینسانەوە تا دوا ئاست و پلەکانی تاکیەتی و لە هەمان کاتیشدا کۆکردنەوەیان لە ناو بنیاتێکی تۆتالیتاریدا و کۆنترۆڵکردنیان لە بەرزترین پلەدا– بەپێی دیدگای فۆکۆ و تەئکیدکردنەوەی جابری لە ڕۆژهەڵاتدا) جا کە ئایدۆلۆژیا خۆی ببێتە چەق و چەرخی شتەکانی تر و قووتیان بدات و لە مەدارەکانی ئەودا باوەخولێیان بێت و دوا تەعریفیشیان بداتێ. بۆیە دەبێ ناچار بکرێ.. هەر هەنگاوێکی بە پەروا و بێ پەروا دەنێت دەشێ بە پەرۆشی ئەندێشەی ئازادی گومان هەڵبسەنگێندرێت. کە ئایدۆلۆژیا لە دوا ڕاڤەدا بیەوێین بۆ داگیرکردن و ئامرازکردن. قسەکەرانیشی لە نێو ئەو مەنگەنەیەدا لە قەرەقۆزێک زیاتر نین (ڕابەر شوانە و ڕەشە خەڵک دەبنە مێگەل و ئەوانەش هاوسەنگی نێوان شوان و مێگەل دەپارێزن سەگەکانن –نیچە–) ئایدۆلۆژیا لە یەک خاڵدا بۆیە جەللادە چونکە یەکەمین قوربانی بانگەشەکەرەکانی خۆین.. هەر لە زمانی ئەو

قوربانیانەشەوە سەلاوات لە دیداری بێ گوناهی خۆی هەڵئەدات. بەم کارەیان درۆزن دەبن لەگەڵ خودی خۆیاندا و.. قوربانیبوونی خۆیان دەڕازێننەوە و بانگهێشتی ئێمەش دەکەن بۆ ئازادی لە دەست جەللادەکانی تر. وەک ئەوەی ئایدۆلۆژیاکەی لەمەڕ خۆی فریادڕەس بێت و جەللاد نەبێت بەسەر خۆیەوە.

ئەمەش جێی سەرسوڕمان نییە چونکە هەنووکە (ئایدۆلۆژیا تریاکێکی نوێیە بۆ خەڵک -کارل پۆپەر-).

ئەو پرسیارەی لێرەدا دێتە پێشێ وێ دەچێ ئەوە بێت.. کە ئایا کەسێک خۆی بەو گرفتانەی ئایدۆلۆژیا مەلاشووی هەڵدرابێتەوە و بەئالیەتەکانی هەمان گرفتیش تەعریفی گشت دیاردەیەکی کردبێ و.. گرفت تا سەر ئێسقانی ڕۆچووبێت و ماهیەتی ئینسانییانەی لە نێو حەسارەکانی ئایدۆلۆژیادا نابووت بووبێتن و جەوهەرەکەی بە هەزار و یەک ڕایەڵی نەبینراو گەمارۆ درابێت.. چۆن چۆنی بەو فرە فاقییەوە دەم لە گرفتەکانی ترەوە بدات و ڕێگاچارە بۆ خۆدۆزینەوە یاخود ڕزگاربوونیان پێشنیار بکات؟

بەڵێ من یەکێک بووم لەو عەوامفریبانەی ئامراز بووم و.. کۆیلە بووم و.. قوربانی بووم! نوقلانەی ئازادیم بۆ خەڵکانی تر لێ دەدا و کەچی خۆم کۆیلەی مەرجەعێک بووم. لە دڵنیاییەکی ئەنتیکە و سەیردا دەژیام و شانازیم بەوەوە دەکرد کە گوایە ئەوە منم لەگەڵ ڕەوتی مێژووی مرۆڤایەتیدا دەڕۆم و.. من یەکێکم لەو ڕەوتە سەرەکییانەی کە حەتمەن دەگات بە ئازادی و یەکسانییەکان! بەڵێ منیش یەکێک بووم «لەو بۆقانەی بەدەوری زەلکاوەکانی ئایدۆلۆژیادا قیرەقیرم دەهات» کە ئیرادەی ئازادی تاکەکان لە ناو قەدەری ئایۆلۆژیادا ئەنفال بکرێن و.. ئایدۆلۆژیا مرۆڤی بۆ گەمەکانی دەسەلاتی خۆی بوێ و گشت دیاردەکان بەشت (شیء) بزانێ بۆ ڕاگرتنی زیندوویێتی خۆی.. ئایا ئەمە لە یەک کاتدا کۆمیدیا و تراژیدیاش نییە وابزانی ئازادیت؟! من لەت ببووم. چونکە دەستێکم بەدەستی دڵنیاییەکانی ئایدۆلۆژیا و دەستەکەی تریشم بەدەست نادڵنیاییەکانی ئەدەبەوە بوو!

وێ دەچێ هەر ئەمەش یەکەمین پریشکی لێکدانەوە و بیرکردنەوەی جیاوازی من بووبێت. گەرەکم بوو لە تابووتی ئایدۆلۆژیا بێمە دەرەوە و بێژم: من نەمردووم و



ئەوەتا خەونم.. گۆرانیم.. سەمام.. گەڕانەکانم!

بەڵێ شکاندنی دەرگای حەساری ئایدۆلۆژیا و سەرفیرازبوونی تاکەکانی.. بەرەو چەند ڕێیانێکیان دەبات. ئیدی لە هەڵبژاردنی وازییەکاندایە دەبینین لە تەنهاییدا ونتر بووین.. یاخود جۆرێک لە خود دۆزینەوە و.. خود بنیاتنان لە دنیای (ئازادی ئیرادە و بیرکردنەوەی جیاواز شکۆفەی کردووە) گشت ئەم بۆچوونانەی سەرەوە بەو مانایە نین، خود قەلایەک بە دەوری خودی خۆیدا هەڵچنێ و نەیەتە دەرەوە! بەڵکو ئەوەیە خود چۆن لە گشت قەلاکاندا تووشی فەرامۆشی نەبێت و لە بێ گەردییان دڵنیا نەبێت! پێم وایە نادڵنیاییەکان فاکتەرێکی باش بن بۆ ئەوەی مرۆڤ بخەنە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی بەرە بەرە داببڕێت لە قەرەباڵغییەکان! ئەو قەرەباڵغییانەی ئەو هیچ دەستێکی تیایاندا نییە و (خود دواندن و ئەوی تر دواندنی) لەسەر پێوە دەدەن یاخود دروستتر لێ ون دەکەن.

گەرچی مرۆڤ لە سەرەتادا دێتە بوون (تەنهایە) ناڵێم (تەنیایە) چونکە ئەو هاتنە دنیایە جەبرییەتێکە و دوور لە ئیرادە و ئیختیاری مرۆڤەکە بەسەریدا سەپێنراوە. کەچی (تەنیایی) چەمکێکی جیاوازە، کە مرۆڤ بەئاگاییەوە و دوور لە جەبرییەتی دەرەوە هەڵی دەبژێرێت و دەبێتە مایەی دۆزینەوەی نەک ونکردنی!

تەنیایە.. لەوەدا کە خۆی چەمکەکان بەرهەم دەهێنێت و مانای تازە بە شتەکان دەبەخشێت و شوناسێکی تازەتر بە خۆی دەدات، بەدەر لەو شوناسانەی ئەقڵییەتی باو لەسەری ڕێککەوتوون و بڕیاریان لەسەری داوە. گەر لەو میانەدا سەیر بکەین (تەنیایی بەهاتە و).. (تەنهایی نەهاتە)! بۆ نموونە: دیکتاتۆرەکان تەنهان.. چەندێک لە دەرەوەڕا چواردەوری خۆیان دەتەنن و.. لایەنگری خەڵکی بەزۆر یا دیماگۆگییانە دەستەبەر دەکەن، کەچی هەر دەبینن تەنهان! وەلێ ئەهلی فیکر و نووسین ڕێک بەپێچەوانەی ئەوانەن و چواردەوری خۆیان چۆڵ دەکەن و بەم کارەیان: دەیانپەرژێ لە نێوان خۆیان و دەوروبەریاندا وردتر و.. قووڵتر و.. لێپرسراوانەتر و.. عاشقانەتر ڕابمێنن و لەو مەسافەیەدا کە لە نێوان خۆیان و ئەو شتەی پەیوەندی لەگەڵدا پەیدا دەکەن دنیایەکی فرە دەوڵەمەند لە خەیاڵ و وێناو تەئەمولاتی وەها بخولقێنێت و سەرفیرازانە بێژێت: ئا ئەمەیە ئاسمانی ڕاستەقینە بۆ فڕینی من!

کەوابێ قەرەباڵغی (تەنیایی): ئیختیارییە و دوورە لە جەبرەوە و جێگە و ڕێگەی ڕۆحی خۆی پێ دەزانێ و هەموو دیالۆگێکیش دێتە گۆڕێ مرۆڤانە و دۆستانەن.

کەچی (تەنهایی): توانەوەیە لە قەرەباڵغییەکی ناچاری و فەرزکراودا و دیالۆگەکان نەزۆک و کارتۆنی و مێگەلین، یا هەر نین! بە مەزەندەی من هەر نووسەرێک زمانێکی تایبەت و تەنیا و تاقانەی بۆ خۆی ئافەریدە بکات و بدۆزێتەوە ئەوا ئازادییەکی تایبەت و تەنیا و تاقانەشی بۆ خۆی دۆزیوەتەوە. هەموو تاکێکیش لە نێوان کێشمەکێش و کێبرکێی (تەنهایی و تەنیاییدایە) چونکە – تەنها– بیرنەکەرەوەیە.. چەپێنراوە.. دەستەمۆیە.. بێدەنگە.. نەزۆکە.. بێزارە لە هەموو شت!

کەچی – تەنیا – ڕێک پێچەوانەی خەسڵەتی ئەوەوەیە. چەشنی (جوناسانی نەوڕەسی) ریچارد باخ، کە ڕێبوار سیوەیلی لە بارەیەوە گوتوویەتی: (شۆڕش و یاخیبوونی جوناسان شۆڕشێکە لە پێناو جیاوازیدا و ڕۆچوونێکە بە ناخی –خود–دا بۆ بەرگریکردن لە سەربەخۆیی خۆی).

(ڕێگە بدەین تەنیایی ستران بچڕێ..... شت بنووسێ، بەسەر شەقامەکاندا پیاسە بکات –سپهری–)..... (زیندەگی نەشئەی تەنیایی..... عاشق هەمیشە تەنیایە –سپهری–).

پێم وایە تەنیایە لە ڕوئیادا.. لە خۆخوێندنەوەدا.. لە فەنتازیا باسەفاکانیدا. کەوابێ بەو مانایە نییە پەیوەندییەکان بکوژرێن و لە ئاستیاندا غەمسارد بین. بەڵکە هەڵیاندەبژێرێت و بە قووڵی و پتەوی و دەکەوێتە پەیوەندییەوە لەگەڵیاندا. گشت ئەمانە لە ئەشکەوتی ئایدۆلۆژیادا بڤەن و جێگەیەکیان نییە لە ئیعرابدا. بە کورتی منیش ئەو تەنیاییە دەخوازم کە (ئەقڵ و دڵی تیا ئازاد دەبێت –نیچە–). ئیدی لە بەرامبەر تاک ڕەهەندی ئایدۆلۆژیادا.. فرە ڕەهەندی و، تاک ڕێگەیدا فرە ڕێگەیی و، لە جێی تاک ناوەندیدا.. فرە ناوەندێتی.

جا ئەگەر (لە پشت هەر ڕەتکردنەوە و هێرشێک بۆ سەر ئایدۆلۆژیا ناپلیۆنێک وەستابێت –پۆل ریکۆر–) ئەوا لە پشت هەموو ڕەتکردنەوە و هێرشێک بۆ سەر تاک و تەنیاکان ئایدۆلۆژییەتێکیش وەستاوە! چونکە پێم وایە ئایدۆلۆژیا جەنگی گشت (تەنهاکانە) دژ بە(تەنیاکان).



ئاوات: توخمی ئاو.. توخمێکی شەفافی بوون و ئازادبوونی ڕوانینە گەڕانەوەیە بۆ سەرەتاکانی سەرەتا.. ئەو تێڕوانینە چییە کە وای کردووە – ئاو – ئامادەیی هەبێت بەو زۆرییە لە شیعرەکانتا؟

ئەنوەر: نیگاکانی ئاو.. نیگاکانی ئازادین بۆ من. جیلوەکانی ئاون دەستی ئەندێشەکانم دەگرن بەرەو سەرمەدییەتی سەما. بێ سرەوتی ئاو.. دەلیلی نەبوونی ماڵێکە بۆ سرەوتن. گەشتی ئاو بەناو سروشتدا.. گەشتی پڕ لە ماخۆلیای ڕۆحی منە بەناو دەقەکاندا و.. ئیشراقی ئاویش بەنامۆییە نائاشناکانم ئاشنا دەکەن.

ئەو چاوەی ئاوی پێ دەبینم هەمان چاوە ئاو لێیەوە دەمبینێ. هەروەک ئەنجیلۆس سیلیۆسی قەشە پێی وابوو.. ئەو چاوەی خودای پێ دەبینێ، هەمان چاوە خوداش لەوێوە دەیبینێ.

وێ دەچێ یەکەم فیتنە و تەلیسمی جێ پەنجەی باران لەو کاتەوە بوو بێت؛ کە منداڵ بووم و... باراناوی ناو گۆلاوەکانی نێوان قوتابخانە و ماڵەوە کێشیان دەکردم. لە وێنەی ئاسمان و درەخت و خانووەکانی ناوی بە قووڵی و سەرسوڕمانەوە ڕادەمام. بە چاوی منداڵانەی من؛ یەک کەون لەو ڕووبەرە چکۆلەیەدا مەلەی دەکرد و خۆی مەلاس دابوو! منیش بە هەموو حەزێکمەوە گەرەکم بوو خۆم هەڵدەمە ئەو قووڵاییە بێ بنەوە! کەچی لە هەمان کاتدا بەترسیشەوە سەرم شۆڕ دەکردەوە، دەترسام بکەومە ناوی و ئیتر کەس نەمبینێتەوە.

کێ دەزانێ.. ئەو گرێ و ترس و خۆشییە چەپێنراوانە مۆتیڤێک نەبن بۆ ئەو لێ خوردبوونەوە عاشقانەیەی من لە ئاو. گەر (لە ناخودئاگاییدا شتەکان فەنا نەبن و ئەبەدی بن –فرۆید–) ئەوا ترسیش لە پانتاییە نەناسراو و لەدەستچووەکانەوە گەراکانی دەپیتێنەوە. بەڵێ، ترس لەوەی یارییەکانی منداڵیم نەمناسنەوە.. ترس لە دەرگا عاسییەکانی غوربەتی.. ترس لە پەژموردەبوونی گوڵستانەکانی عیشق! وا هەست دەکەم خودی ژیان مامان و گۆڕهەڵکەنی ئەو ترسە کەینونیانە بێت، کە هەر دەڵێی جاویدانین!

جا کە ترس.. تەنیایی.. گوناه.. مەرگ.. چاوەڕوانی، بە چەک و تفاقەکانیانەوە

بێن و لە وشەدا چینە و لانە بکەن و ماناکانی خۆیان بەدوا مانا نیشانی ئێمە بدەن!

ئیدی ئەرکێک لەو نێوەدا بۆ ئەدەب پەیدا ببێت.

بەرزەخ و مەحالاتی، نێو موتەناهی و لاموتەناهییەکانە. بۆ خاتری هەڵکۆڵین و دواندنی زیاتر و گۆڕینی موتڵەقییانە بە نسبیەت! ئەمەش بە پێبەخشینی وەزیفە و ڕەهەندی ئیستاتیکییانەی تر دەبێت لەسەر وشەکان. چونکە (شاعیر لەو جیهانەدا دەژی کە دروستی دەکات –ئەدۆنیس–) ئەمانەش دەبنە باعیسی ئەوەی گەرچی ترس لاڵمان دەکات.. وەلێ بە گۆڕینی جێگە و ڕێگە و ناوەندی ماناکانیان، هەر ئەو برینانەی خۆیان دروستیان کردووە جارێکی تر بۆمان تیمار بکەنەوە.

بە بارێکی تریشدا وای دەبینم پەیوەندی و پانۆرامای (من، باران... باران، من) خۆویست یان خۆنەویست، ئەوەبێت لە مەملەکەتی شیعردا لە دووی ئاشتبوونەوەیەک هەڵوەدا بین لە نێوان مرۆڤ و سروشتدا! ئەمەش خود بە خود دەخوازێ بگەڕێین بۆ ئاشنابوون بەڕەهەندە نائاشناکانی ئاو. باران، کردەیەکە لە نێوان ئاسمان و.. زەوی. یان بە گوزارشتێکی تر نادیار و.. دیار.

لێرەوە هەڵکۆڵینی ڕەهەندەکانی باران؛ بردنەوەی منە بۆ ناو خودی خۆم. لە ساتەوەختی، گەیشتنی چالاکترین سپێرمی باوکم بۆ حزووری هێلکەی دایکم، ترووکانی هێلکە و گەورەبوونی لە ئاودا.

ئیدی لەوێوە.. لە هەمووڕاوە.. لە هیچڕاوە

ئاخاوتنەکان دەست پێ دەکەن، کە پرۆسەی خود نووسینەوەیە. تاوەکو گەیشتن بەدەق.. دەقێکی ئاوی.

لە میانەی ئەو خود نووسین و خود خوێندنەوەیەدایە، بە زنجیرەیەک لە دیار – نادیاردا دەڕۆین و تێدەپەڕین. لە دوا جاردا کارلێکەکان و هاوکێشەکان دەبنە سەرەتای نادیارێکی تر، کە ئەمەش مۆتیڤی بەردەوامی و سەرهەڵدانی نووسینی ترە لە ناو نووسیندا و.. کرانەوەی ترە لە ناو ئاسۆی تردا. گەر ئەمانە ئیحاگەلێک بن بۆ گوزارشتکردن لە نائارامییە کەینونییەکان –ئەوا– لەو سروتەدایە بێ زمانی باران دێتە زمان و تلقائیەن تێکەڵ بە ئەندێشەکانی ئێمە دەبن – واتە – بە ئەزموونکردنی دنیا ئەزموون نەکراوەکانی باران. بەمەش ڕووبەرەکانی – تخیل– و ئیختیارەکانیش



کارسازییان فرەوانتر دەبن و دوا جار بە ڕۆح ئیفلیجی و غەمساردییەوە لە ڕۆحی زیندووی باران نارِوانین و.. ڕیتم و سەما و ڕەنگەکانیش بە ڕۆح والآیی خۆیان ڕۆحی ئێمەش والآتر دەکەن و بێ هیچ تەکلیف لە خۆکردنێک ناچۆراڵییانە زمانیان دەپژێ و بە زگماکی خۆیان لە خۆیان دەدوێن و هەقایەت و خەوننامەکانیانمان بۆ دەگێڕنەوە.

بەڵێ لە نێوان من، باران... باران، من، باڵانس و هارمۆنیکییەتێکی وەها پێک دێت کە – منی باران و بارانی من – بە ڕەهەندەکانی گیانی یەکدی غەریب نابین. سواربوونی کەشتییە ڕەنگاوڕەنگەکانی باران و بە ناخودابوونی (کاپتن) من. بۆ سەفەرنامەکانی ئەویش دەبێتە (ڕێککەوتنامەیەکی ئیستاتیکی) ئەوتۆ کە بە گوێی خۆمان گوێمان لە گۆرانی و زەمزەمەکانی ناخی یەکتر دەبێت لەو سەفەرانەدا.

نەک ئەحکامە پێشوەختەکانی ئایدۆلۆژیا و تەوری کلێشە و – برۆکۆست–ی ئەو لۆجیکانەی دەمانخەنە سەر قەرەوێڵە بێ ڕۆحەکانیان، هەتا کەم و زیادکردنەکانی جەستەی زیندوومان بەپێی پەیامەکانیان لێ ببڕن!

گەر ئەم ڕزگارییە بۆ باران شیاو بێت – ئەوا – دەکاتە کۆنکرێتبوونی ڕزگارییەکانی ئێمەش. ئاخر بیرمان نەچێت لە نێوان ئەو کارلێکە دەروونییانەی ئاماژە و ئاخاوتن و خەیاڵە سەرکەکاندا (منی شاعیر) بە مانا تازەکان دروستبوونێکی تر دروست دەبم.

ئەم دروستبوونەش تا ئەو ساتە بە تازە ناز دەکرێت کە لە لایەک: لایەنە دووبارەنەبووەکانی باران بووبێتە ئامانجی خەیاڵ و ڕامان و دابڕانێکی – جیدی لەگەڵ گوزارشتە گوتراو و.. قبووڵکراو و.. فۆرمالیتەکانی پێشوو ڕووی دابێ و گەیشتن– بە وێنە و گوزارەی تری ئەوها کە خۆشت دەچییە ئەو گەلەرییەوە وەک هەر کەسێکی تر بە تاسە و ئیشتیاقێکەوە دەڕوانیتە ئەو تابلۆ تەلیسماوییانەی باران.

گەر وەسوەسەی (هاوئاهەنگی – نائاهەنگی) لە نێوان جینالۆجیای من، باران... باران، من. بێتە دەست هەر لەوێدا نەمرییەکی وەهمی بۆ: پرسیار و گومان و سەفەری تر دێتە پێشێ! بەڵێ کە ئاو؛ ئەگەرە لاموتەناهییەکانی وجود بێت و (جوانیش دەربڕینی عاشقانەی شێوەکان بێت –سپهری–) ئەوا.. ئاو یاخود باران؛

ئەو فرە شێوە.. بێ شێوەیەیە کە تا نازمان کردبێت.. ناز نەکراوە. جا کە ئاو ئەو تەلیسمە بێت لە دەریاوە تەنها بگەینە سەرابی و.. لە سەرابەکانییەوە بکارین بیابانە بێ سەرحەدەکانی بدوێنین)، ئیتر چۆن لە دوا وێنەی دڵنیا بم؟

دەشێ هەر ئەو گومانە یەک لە دوای یەکانە، هۆیەک بن بۆ وێنە لە دوای وێنە و.. خەیاڵ لە دوای خەیاڵ ڕێچکە ببەستن و تێر لە بینینیان نەخۆم! ئیدی باران ئاماژەیە و ئاماژەی تری تیا لە دایک دەبێت.

جا منیش منداڵێکی لاسار و دانەسەکنا و لە باغی هەمیشە تەڕ و سەوزی زماندا بۆ جوانی و سیحری باران دەگەڕێم. باران منداڵێکە و.. بۆ ئەبەد بە منداڵی دەمێنێتەوە شاعیر ئاسا. فرە مەودایی.. من و باران.. باران و جیهان.. جیهان و من.. من و بوون. بوون و باران. جیهان و بوون.. تاد کارلێکێکی هێندە ئاڵۆز و بە بەهات پێک دەهێنن کە تیایدا نامۆ دەبم.. نامۆبوونێکی شیرین و بە بەرەکەت!

ئا بۆ من شیعر – خۆنامۆکردنە هەم خۆدۆزینەوەیە. خۆحەشاردانە و هەم خۆکەشفکردنە! ئەم گەمە و سەما سرکانەش جێگیر نین تا دوا مۆریان لێ بدەین و لە ماڵی تەعریفێکدا جێگیریان بکەین. گەر شیعر کەوتە ئەو ڕاوگەیەوە ئەوا گەمە و سەماکانی تەزویرن و جووڵەیان جووڵەی ڕاستەقینەی ڕۆحێکی ئازاد و سەرفیراز بوونین. ئەو بێ جووڵییەش یەعنی: مەرگی ئەندێشەکان!

ئا بیرم نەچێت.. ئەو یەکتر دواندن و هێنانە قسەیەی نێوان من و باران، شتنەوەی وێنە نەشۆراوەکانی ناخی یەکتریشە و.. بەپێویست دەڕژێینە ناو دەهالیزەکانی دەروونی یەکترەوە. بەزمانێکی تر جارێک خۆی پاک دەکاتەوە لەبەر من و.. جارێک من پاک دەکاتەوە لەبەر خۆی. ئەم ڕێککەوتنە پڕ ئاڵوگۆڕ و جیاوازییەش مەرجێکە بۆ زامنکردن و بووژاندنەوەی (دیالێکتیکی مانا).

باران نەوتراوەکانی من دەڵێت و منیش نەوتراوەکانی ئەو. ئەو جارێک سێبەری ڕۆحی منە و.. جارێک من سێبەری ڕۆحی ئەوم. ئاخر ئەم جوانییە پڕ ناشیرینییە و ئەم ناشیرینییە پڕ جوانییەی دواندن و هەقایەتەکان و تەواونەبوونیان دەستەبەرکەری درێژکردنەوەی زیندەگانییە لە بەردەم شەهرەیاری مەرگدا! جا کە ئاو.. دایک و باوک و فرزەندی وجود بێت! بۆ هەر جێگەیەکیش بچین لەگەڵماندایە و



لەناوماندایە و ناتوانین بیخەینە ناو شەجەرەی نەبوونەوە! بگرە بگەینە جیلوەگای نەبوونەکانیشیەوە جا وەرە واز لە شتێک بهێنە خۆی دایکی شێوەکان بێت؟ ئەمەش ئاشووبێکی شادی هێنەر و دڵنشینە.. وا نییە؟

ئاوات: (لە نێوان کەوتنە خوارەوەی گەڵایەک و لقی درەختێک، بیابانێک هەیە) ئەمە کۆپلەیەکی چڕە لە شیعرێکتا. قسەکەم ئەوەیە: زەمەنی پێوانی شاعیر جیایە لە زەمەنی پێوانی ئاسایی. کەواتە شیعر نووسین کردەی هەوڵدانە بۆ دروستکرنی جبهانێکی تر کە دیارە بە تێڕوانینی شاعیر جوانترە لە جیهانی ئێستای؟

ئەنوەر: هەڵبەت ئەو مەنزڵە بێ مەنزڵەی کە شاعیر گەرەکییە تیا دابسەکنێت یۆتۆبیایە! یۆتۆبیاش.. تەڵاقی خۆی وەرگرتووە لەو تەعریفاتە واقیعییەی دراوە بە (شوێن و زەمەن). ئەو واقیعییەتە جارسکەرەی کە هەر خۆی دنەدەری شاعیر بووە بۆ ئەو دنیا بێ سەروشوێنە! جا کە ئەو واقیعە لە ناو خۆیدا دەمکوتی کردبێ.. ئەوا لە یۆتۆبیاکەیدا دێتە دەنگ و هەموو ئەو ڕەگەزانەشی ئیشیان تیا دەکات دەمامکی گۆڤەندی ناو ئەو یۆتۆبیایە دەپۆشن. زمانی.. لێکدانەوەی.. هەنگاوەکانی گشتی جیان! کەوابێ مەرجێکی چوونە ناو یۆتۆبیا جیاییە..! بۆ ئەوەی ئەم جیاییەش بە هەست و پێستەوە لە مانا فۆرمالیتییەکانی جودا ببێتەوە؛ دەشێ دەسەڵاتی خۆی هەبێت و.. بەو دەسەڵاتە کار بکات و لۆجیکی گشت شتەکان هەڵبووەشێنێتەوە! واتە – بە نالۆجیکییەتی شتەکان.. لۆجیکێکی تر بەپێودانگی یۆتۆبیاکە دروست بکاتەوە. ئەمەش بەو مانایە دێت، بە دارمانی لۆجیکی دەرەوە (کە نالۆجیکییە بۆ شاعیر و، بیناکردنەوەی نالۆجیکییەتێکی تر لە ناوەوەیدا، کە لۆجیکی یۆتۆبیایە و.. نالۆجیکییە بۆ دەرەوەی خۆی)!! بەڵێ.. هەموو ئەو لۆجیکانەی شاعیر دەیهێنێتە گۆڕێ و ناویان لێ دەنێت و ئیشیان پێ دەکات گشتی ئەفسانەیین! چونکە لەدایکبووی جێگەیەکن کە خۆی نییە و ئەفسانەییە لە کاتێکدا (ئەفسانەش زەروورە بۆ تەواوکردنی کەموکوڕییەکانی واقیع –شتراوس–)

هەر بەم دەستەواژە نوێیە و ڕەنگاڵەییەشیان.. ئیعلانی گشت جیاوازییە

نامەئلوفەکانی خۆی دەکات، لە بەرامبەر مەئلوفیەتی واقیعە تەقلیدییەکەدا و.. لەو پرسیارانەی لێ دەکات کە ڕێبین هەردی گوتەنی: (لە جەوهەردا پرسیار بریتییە لە گێڕانەوەی – ناکۆکی– بۆ جێگایەک کە خۆی بێ ناکۆکی دەبینێت)! کەواتە هەر لە یۆتۆبیاکانەوە ڕووبەڕووی ئەو واقیعییەتە دەبینەوە کە خۆی بێ ناکۆکی دەبینێ.

ئایدۆلۆژیای ئەو واقیعییەتە کۆنسێرڤەتیف و پاسیڤە... وەلێ یۆتۆبیا ئافەریدەساز و بێ سرەوتە. (ئەو ئایدۆلۆژیایەی ئاسۆییـیانە و ڕاگوزەرانە لە ڕووی دەرەوەی شتەکان دەدوێت بەخزمەتی خۆی. کەچی یۆتۆبیا شاقوڵییانە و فرەمەودا ناوی ناوەوەی شتەکان دەهێنێتە گۆ بۆ خزمەتی ئەو شتە خۆی...) کە ئەمەش لەوێوە ڕاگەیشتنیشە بەخودی خۆیشی! ئەو واقیعییەتە فریودەرەی بە بیانووی سەرگەرمی بە مێژووە قەبەکانەوە... وردە مێژووەکانی فڕێ داوەتە دەرەوە! کە لە ڕاستیدا شتێک نییە گەورە و بچووک بێت.. ئەوە دەسەڵاتی بینین – و تەفسیرەکانە گەورە و بچووکی بەسەر دیاردەکاندا دەبەخشن و دەسەپێنن. ئەگینا هەموو دیاردەگەلێک – نسبیەتی– گەورە و بچووکی لە خۆیدا هەڵگرتووە! گەر حوکمی قۆناغیش لە بەراوردکارییەکانیدا ئەفزەڵیەتێکی ئەبەدی فەرز بکات و ئامبالای دیاردەکان بە جەبرەکانی خۆی دابپۆشێ! لەو کاتەدا ناتوانین گشت ڕەهەندێ ناز بکەین و شیتەڵ بکەینەوە و بکەوینە دیالۆگ لەگەڵیدا! ئەودەمە دەتوانین بڵێین: (هیچ چاوێک عاشقانە نەیڕوانییە زەوی). هیچ کەس بە بینینی پەنجەرەیەک شەیدا نەبوو هیچ کەس قەلەباچکەیەکی بەسەر کێڵگەوە، بەجیدی وەرنەگرت –سپهری–) لە ڕاستیدا ناتوانم گومان نەکەم لە دڵسۆزی ئەوەی فریوم دەدات بە دارستانێک و کەچی ڕووداوەکانی ناو دارستان نابینێ و.. شەیدای نابێ و.. بەجیدی وەری ناگرێت! (مەگەر چکۆلەترین وردتکەی ئەم جیهانە، دنیایەکی بێ کۆتایی نییە؟ –نیچە–) بۆ زەمەنی ئەفسانەییش، نموونەیەکی زیندووت بۆ دەهێنمەوە.

لە تەلەفزیۆندا کە چەند دیمەنێکی کۆڕەوەکەی پیشان دەدایەوە. کە دیارە لە ناخی سڕکراوی هەر بنیادەمێکدا دەیان شانامەی تراژیدی بەیاننەکراو هەبوو! وەلێ ئەوەی جێی سەرنج بوو بۆ من: هەڵبڕینی مناڵێک بوو بە دەستی کەسێکەوە کە دەیویست بیداتە دەست دایکەکەی کە لە لۆرییەکدا بوو ڕێی دەکرد.. لە نێوان مناڵە



هەڵبڕاوەکە و دایکەکەدا هەر ٥٠ سانتیمەترێک نێوان و فاسیلەیان بوو. بەپێوانەی زەمەنیش هەر زۆر کورت ماوە بوو – بەڵام – بۆ دیتنی من، ئەو دیمەنە: نە مەسافەکەی.. نە زەمەنەکەی هێندە کورت نەبوون بەڵکو بیابان و زەمەنێکی ئەفسانەیی لاموتەناهی بوو لە (مەحاڵ)!

مەحاڵی نێوان گەیشتن و نەگەیشتن.. خورپە و لێکدابڕان.. ونبوون و یەکدی نەبینینەوە.. تەنهابوون.. ترس و.. بەندی دڵ پچڕان و.. جەرگ هەڵقرچان و.. لەدایکبوونی مەرگەساتەکان و.. تاد! تەماهیبوون لەگەڵ ئەو حاڵەتە پڕ لە مەحالانەدایە – شاعیر– لە سیاسی و.. ژورنالیست و.. شۆڕشگێڕ و.. خەڵکانی تر جیا دەکاتەوە! شیعریش بێ ئەو ئەفسانانەی کە سازیان دەکات سازگارییەکانی دەمرێت. چونکە شیعر بۆ خۆی جۆرێکە لەو ئەفسانانە.

شاعیریش دێوانەی ناو ئەو مەملەکەتەیە و (دنیای دێوانەیش نە هەقیقەتی تیا پایەدارە و نە دڵنیایی –نیچە–) ئا لێرەوەیە بەربوونەوە و لێکدابڕانی گەڵا و لق؛ بۆ من ماناداره و جێی ڕامان و بینینە چونکە نابینرێ.. چونکە مەحاڵە (چارەسەری مەحاڵیش هەر مەحاڵ خۆیەتی –نیچە–)!! ئەمەیە ڕاهێنانی ڕۆح بۆ ئێشکگری و مانەوە بەدیار غەمی هەناسەی لانەوازێکەوە! لە دەرگادانی ئەو دەرگایانەی کە چاوەڕێی لێدانن! ئەو –با–یەی پێویستی بەهاودەمێک هەیە لە شەوێکدا لەگەڵیدابێت و گوێی لە قسەکانی دڵی بێت لە – مەنفایەکی ئازاد–دا!! چی تر من ناتوانم گەر کەمێکیش بێت.. متمانە بە ئیحساسی ئەو کەسە نەکەم، کە گرنگی بە برینی سەگێکی نەناس دەدات! لە غەمی ئازادبوونی پشیلەیەکدایە کە گۆشتەکەی ماڵی خۆیانی خواردووە. گەرچی ئەمانە عاتیفەی ڕووت دیارن وەلێ مەرجگەلێکی.. بێ مەرجن بۆ ناسینەوەی ئینتمای ئەو کەسە وەک لێپرسراوییەتی و ئەخلاق.

ئاخر چۆن هەست بە – بێ گوناهی– ئەوانە نەکەم کە هەست بە – گوناه– دەکەن، لە بەرامبەر شتەکانی تردا و.. تەنانەت گوێشیان لە (دەنگی پێی ئاوە –سپهری–).

ئەوە دیکتاتۆرەکانن هەمیشە خۆیان بەبێ گوناه دەبینن و.. دەرەوەی خۆیان بەگوناهبار لە قەڵەم دەدەن و سزایان دەدەن.

بەلای منەوە هەر ئەوەیە نهێنی قسە پڕ پرسیارەکەی ژنە شاعیری ئینگلیزی

(کاترین رین) کە دەبێژێ: (ئێمە دەربارەی قەترەیەک دەزانین لە ناو زەریادا، وەلێ ئەی زەریای ناو قەترە چی؟!) ئەم تێرامان و وردبینییانە ئەگەری تر بۆ کرانەوەی ئاسۆ لە ناو ئاسۆی بینینماندا فرەتر و بەبەرەکەتتر دەکەن و.. کەرەستەیەکی شاعیرانەش دەخەنە بەردەستی ڕۆحی شاعیر بۆ ئیشکردنە ئیستاتیکییەکانی و ناولێنانیان. ئاخر (کەسانی تازەگەر زۆر جاران ناولێنەری شتەکان بوون –نیچە–) کە کۆی هەموو ئەو ڕەگەزانە لە بەرژەوەندی زیندوویەتی دەقی شیعریدان... ئەو شیعرانەی – زۆربا–یانە ئازاد و سەرفیراز دەژین و دەڵێی – بەردی فەیلەسووفەکانیان– لە گیرفاندایە.

ئاوات: نەبوونی سنوور یا پابەندنەبوون بەجوگرافیای شوێنەوە کارێکە نوێیە لە شیعری کوردیدا. بەڵام لە ڕۆژئاوا عەیامێکە کاری پێ دەکرێت. پرسیارەکەم ئەوەیە لە شیعری تۆدا ئەم پابەندنەبوونە بەجوگرافیای شوێنەوە ئامادەیی هەیە ئایا بەجیهانیبوونی ئەدەب ئەم جۆرە تێڕوانینەی لە هزری تۆدا سەقامگیر کردووە؟

ئەنوەر: پێم وایە جیهانی ئەدیب مامەڵەکردن و ژیان و مردن و تەماهیبوونە لەگەڵ بزاڤە میتافیزیکییەکانی وشەدا و.. هەر فەنتازیا نازکراو و.. نازنەکراوەکانی وشەشن دەبنە – مەودا– جیا جیاکانی ئەو وجودە سەرکێش و سرکەی شیعر.

لەوێڕا بەپراکتیکبوونی روئیا و.. وێناکانی وشە لە بۆشاییەکاندا چارەنووسی خۆیان دەدەنە دەست کراوانە هەمیشەییەکەی خۆیان. ئیتر (ئازادی وشە و.. ئازادی خوێنەر دەبنە سەرهەڵدانی فرە ئاماژەیی و فرە مانایی و.. ئاراستەی ئەو ڕەهەندانەن دەستنیشانی سنوور تەسکی یا بێ سنووری بەتێکست دەبەخشن) نەک خواستی نووسەر بە تەنها. دەنا کێ هەیە حەز نەکات جیهانی بێت؟ بۆیە وەک خۆم کە شیعر فرە فۆرمی نامۆبوون و هەیەجاناتەکانی ڕۆحم بێت، ئەم حاڵەتە ناشەمزێنم و.. چاو لەدووی شەپۆلە خۆڕسکەکانی ئەو نامۆبوون و هەیەجاناتانە دەبم، کە چ فۆرمگەلێک هەڵدەبژێرن بۆ خۆیان.،، بێ ئەوەی لێی بپرسم بەرەو کوێم دەبات.

لێی دەگەڕێم هێدی هێدی ئەو پانۆڕامایە خۆی خۆی بنووسێتەوە. جا ئەو



پرۆسەیەش پڕە لە گەیشتن و نەگەیشتن.. سەوزبوون و هەڵوەرین.. بیابان و بارانی بە خوڕەمی کوێستان.. سەفەری سەرمەدی و..، وچانگرتن لەسەر ڕێزە ڕێزەی ئەو سەفەرە – واتە – مەوجدانی تێکستێ کە پێیەکی لەسەر– بوون–ە و، پێیەکی تری لەسەر – نەبوون–ە! من ئەو مرۆڤە لەتبووەی نێوان ئەو کێشمەکێشانەم و دەق–یش هێورییەکی یاخود وچانێکی دوای ئەو کێشمەکێشانەن. تۆ بڵێی ئەو ژانە بەژن زراڤ و قەشەنگە هەستێکی زاتی یاخود گشتی بێت؟

من لەوازییەکی ڕۆحی دەدوێم جوانە کە دەبێت بەتێکست و دزێویشە لەبەرئەوەی وێناکردنەوەی گشت کێشمەکێشەکە نین.

کە تێکست پەرشبوونەوە و جەمبوونەوە بێت. کە لە ئاوێنەکانیدا لە خۆت ڕادەمێنی هێشتا تێکستەکانی خودی خۆت نین! ئەی– خود–ی من کامەیە...؟

وێ دەچێ بەردەوامی تێکستەکان – واتە – گەڕانی هەمیشەیی بەدوای خودی خۆتدا. گەڕان لەدوی دوا فۆرمی ڕۆحێکی پەی دەر پەیدا. کە ئەمەش مەحاڵ بێت، کەوابێ شیعر گەڕانێکی ئەبەدییە بۆ گوزارشتکردن لەو فۆرمە مەحاڵە! کە ئەو فۆرمە... بێ فۆرمەش نارسیسیەتی – خود–ێکی بە تێکستکراو نیشان نەداتەوە و تیرۆری کردبێت، یاخود تیرۆری بکات. شاعیریش ناچارە گومان لە هەموو فۆرمێک بکات. کەوابێ دوا شیعریش وجودی نییە. ئەمەیە بروست گوتەنی: (بەهەشتی ڕاستەقینە بەهەشتی ونبووە) جا لە ڕێگەی ئەو دەقەوە خوێنەریش بتوانێ مومارەسەی وجود و ئازادی ئاگاییانەی خۆی بکات. ئەو دەمە شیعرەکە (ئەو ڕووبارەیە کە هەموو کەسێک دەتوانێ بەئەندازەی پەرداخەکەی خۆی ئاوی لێ بخواتەوە.. بێ ئەوەی لە ئاوی ڕووبارەکە کەم بێتەوە – نیمایۆشیج–). میکانیزمێکی تری ئەوەی شیعر ڕووی لە جیهانیبوونە بەلای منەوە دەگەڕێتەوە بۆ شکاندنی ئەو چەمکە دۆگما و بێ ڕۆحانەی ئایدۆلۆژیا و یاوەرەکانی کە بوونی فەردییانەی مرۆڤی ئێمەیان سڕیبووەوە و سەربەخۆیی ڕۆحی خۆی لە دەست دابوو! بۆیە هەموو شتێکی گیانفیدای ئەو دەکرد. هەنووکە خود و.. تەنیایی و.. ئازادی و.. ئیغتراب... تاد چەمکگەلێکی وجودی و گەردوونین و ساناتر ڕەهەندێکی کراوەتر و جیهانی دەدات بە دەق.

نەک بڕیاری پێشوەختی شاعیرەکە. هەر ساتەوەختێ نووسەر خۆی لە سنووری بەندە بە قاعیدە-بووەکان ڕاپسکان و سەرگەرمی حاڵەتە -استثناء-ەکان بوو پەنجەرەی زیاتری والا کردووە بە ڕووی دیدگا و جیهانبینییە ئیستاتیکییەکانیدا. داخۆ ئێمە ئەو ستایشکەرانەین لە دنیای شیعردا!؟

ئاوات: پرۆسیسی نووسینی شیعر، ئێستا.. لە لای شاعیرانی تازە (کە دیارە بە ژمارە کەمن) ژێرخانێکی مەعریفی هەیە، واتا کاتێ دەقێکی شیعری نوێ گوێبیست دەبین هەست دەکەین لە ڕۆشنبیرییەکی چڕەوە بەرهەم هاتووە ڕاڤەت بۆ ئەم گوتەیە چییە؟

ئەنوەر: بۆ ئەوەی تێپەڕاندن هەبێت، بەناچاری دەشێ جورئەت هەبێت. جورئەتیش ئامادەیی دەوێ.. ئامادەگی باوەشکردن بەمەحاڵدا! جووڵان لە مەحالاتەکانیشدا قودرەتێکە کە مەعریفەی تیا دەتەقێتەوە. (کە مەعریفەیەکی - حیسی- وایە کە ناتوانین بەڵگەی بۆ بهێنینەوە یاخود ئەندازەگیری بکەین) تەنها دەتوانین هەستی پێ بکەین. چونکە ناشێ وجودییەتی مەعریفە، وجودی شیعرییەکە کەمڕەنگ بکاتەوە، بەڵکە دەبێ لە ناو ئەودا - واتە - شیعردا ئافەریدە ببێت. وەک ئەوەی (میوەیەک لە گوڵ دروست ببێت) ئیتر ناتوانین بڵێین کامیان لە کامیانەوەیە چونکە بەریش هەیە گوڵە. بەڵێ شیعر بۆ هەیبەتە تەلیسماوییەکەی خۆی تەنها ناتوانێت متمانە بە ئاستێکی غەریزییانەی شیعر ببەستێ و.. تەنها بە ڕەهەندێک و کەرەستەکانی ئەو ڕەهەندە خۆی بینا بکات. گەر کردیشی سوپەرستاێل نابێت یاخود شیعرێکی عادەتی دەبێت نەک - فوق العادة - !

بۆیە کۆمەڵێ ئاست و مەودا و ڕەهەند و کەرەستەی تر هەن کە بەشداری لە گرێچنی ئەو پانۆرامایەدا دەکەن و.. قووڵی و.. دووری جیا جیا و تۆکمەتری پێ دەبەخشن. کە ئەمە جورئەت و ئامادەگی تازە لە شاعیرەکەدا دەتەقێننەوە.. کە هیچ سنوورێک بە ڕەسمی نەناسێت. تەنها (لێ بگەڕێت گوڵی شیعر خۆی لە خۆیدا بپشکوێ) دەشێ لە سایەی ڕۆشنبیرییەکی قرچۆک و دەردەدار و تەنکی کوردیدا، نەتوانین لە شیعرێکی چکۆلەدا... پرسیاری گەورە لە پێشدەم ژیان و دنیادا



دابنێین!؟ کە ئەمە بۆ خۆی دەگمەنە و ئەوە بۆ ڕۆشنبیری کوردی لە ڕیزی نەبووندایە (بمبەخشە ئەمە بۆچوونێکی لاسارانەی منە). نەبوونی ئەم حاڵەتانە بۆ شاعیر دەرەنجام تووشی پێچە بەدەورە و بابەخولێی دەکات بەدەوری ناوەندێکدا، کە بە زیانی شیعر و لاڵبوون و هەژاری جیهانبینییەکەی دەگەڕێتەوە. گەرچی گشت ئەمانە بە ڕاستی وەربگرین - ئەوا- زۆر دوورە لەو قەید و بەندە نەزۆکانەیەی ئایدۆلۆژیا بە زۆر دەیکات بە ئەرکی ئەدەب لە خزمەت نەتەوە و.. چین و.. بەرژەوەندی تر. ئیدی ئەو خۆ ڕاپسکانە بەئاگایانەی - فەرد- لە تاک میتۆدی و تاک مەرجەعی و کردنەوەی چەندین پەنجەرەی ڕۆشنبیری تر... ڕوونبینی و لە هەمان کاتدا نەفەس درێژییەکی عارفانە دەبەخشن بە شاعیرەکە. دیارە ئەزموونی دەوڵەمەند و چڕ و پڕیش متمانە بەخۆبوون و شارەزایی و شوێن پێهەڵگرتنی ئەگەری تر ئیرادەی ناترسێنێ و دەکەوێتە هەڵکۆڵین و ئەناتۆمیەتی شتەکان.. کە لە پێناو ڕیسکە ئیستاتیکییەکەیدایەتی و.. زامنکەری ڕەوتە بێ سرەوتەکەی سرەوتە شیعرییەکەشین. جا بۆ ئەوەی تێشووی ئەو سەفەرە ڕوو لە بەرەهوت نەکات و هەمیشە تەڕاوەت و هەڵقوڵینی خۆی بپارێزێ و تازە بکاتەوە دەخوازێ ئەو پەندە کلاسیکییە بە خۆی بسەلمێنێ و دووبارە بکاتەوە (کە چەندێ لە خوێندنەوەی بەردەوامدا بێ و بزانێ هێشتا نەیزانیوە) واتە کارکردن لە (- نەزانین-دا و لە - نەبوون-دا) و لە مەحاڵەکاندا.

ئەمەش داینەمۆی دنیای فەردێکە کە هیچ پشت و پەناگایەک پەی نابات جگە لە بەرهەمهێنانی مەعریفە و ئیش پێکردنیان. بۆ بە دیارکەوتنی ئاماژەکان و خوڵقاندنی فیکرێکی تر. کە لە دەرئەنجامی کایە مەعریفی و ئەو پەیوەندییە ئاڵوگۆڕکەرانەدا لە نێو ڕێڕەوە شیعرییەکەدا چاویان کردۆتەوە و لە خزمەت نارسیستیەتە شیعرییەکەدا هاتوونەتە وجود بۆ خاتری کەشفکردنی: نهێنی نێوان بەرزەخەکانی ئەقڵ و ڕۆح. ڕوانین و شت، خود و ئەوانی تر و.. تاد ڕوودانی ئەو پرۆسیسە یەک بەدوایەکانەش هەر کەوتۆتە سەر کەشوهەوا پڕ قەریحەکەی دەقە شیعرییەکە، کە چۆن زەمینە و بوار بۆ دروستبوون و هاتنە گۆی زمانەکانی تر دەڕەخسێنێ کە هەڕەشە لە وجودی شیعرەکە ناکەن.

بەڵێ بۆ ئەوەی چی تر شیعر تەڵقیندراو و.. دەستکورتێکی بەرقاپی ناوەندە یەقینگەراو دۆگماکان نەبێت. وا پێویست دەکات بە کایە مەعریفییەکان پرسیار و گومانەکانی بەجێ و دەوڵەمەند بکات... هەتا کارساز بێت و لە گشت هەنگاوێکدا متمانە بکاتە سەر سازگارییەتی گەنجینە مەعریفییەکانی خۆی.

کە شیعر دۆزینەوەی پێگەیەکی نەناسراوی تری ژیان بێت لە جوگرافیای –وجود– دا. ئیدی مەعریفە لە گشتییەتی خۆیدا مامانی فیکرەی تر دەبێ، بۆ تێگەیشتن لەو پێگەیە و هەروا ئەگەری کەشفکردن و ئافەریدەکردنی پێگەی تری نائاشنا ساناتر دەکەن.

وەلێ چۆن بەهرە بە تەنها وەک ڕەهەندێک بەس نییە بۆ بەردەوامی شیعری زیندوو.. ئاوهاش مەعریفە ڕووت و قووتەکان نین شیعر دەهێننە وجود. گەر هەر هەوڵێکیش لەو میانەدا بدرێ تا سەر ناگاتە هیچ. گەر دروستیش بێت گوتارێکی کۆلاجکراوی ئەوتۆ دێتە گۆڕێ کە شیعرییەتی تێدا نابێت، گەر تیاشیدابێ نە ژیانی لێ دەچۆڕێ.. نە ڕۆحی تیایە. بەڵکە ئینسکلۆپیدیایەک دەبێت لە خڕکردنەوە و تۆمارکردنی زانیارییەکان و هیچی تر!

بەڵێ بەتەنها باڵێکی مەعریفە شیعر هەڵنافڕێنێ – بەڵکە – هەماهەنگی ڕەنگەکانن پەلکەزێڕینەی شیعر دەنەخشێنن لە ئاسمانی کراوەی دەقدا! (ئەو ئاسمانە بێ پایانەی.. ئاسمانێکە کە لەوێ نەزەمینێکە و نە ئاوێک.. نە ئاگر و نە هەوایەک.. ئەو ئاسمانە نە مەحدودیەتی شوێنە، نە نا مەحدودیەتی زانیارییەکانە.. ئاسمانی نەمان، نەبوون نە ئاسمانی ئیدراک و نەبێ ئیدراک. نە ئەم جیهانە نە جیهانێکی تر.. نە هەردووکیشیان. نە خۆرەتاو و نە مانگ. ئەی ئەوانەی کە ئەم ڕێگەیە دەپێون، دەڵێم: کە نە هاتن هەیە، نە ڕۆیشتن نە بەردەوامی و نە وێرانی. نە بەرهەمهێنان، ئەو بێ بنیات و بێ تەکامول و بێ شەرتە ئەمە کۆتایی ڕەنجە –بودا–)

ئاوات: دیمەنە یەک لە دوا یەکەکانی وێنە (یان وردتر: دیالۆگکردنێکی چڕ بە چەندان برووسکە شیعر) کە وا دەکات لە سەرجەم گۆشە نیگاکانەوە دیاردەیەکی ئاسایی– مەئلوف – بکەیتە پرۆسەیەکی ئەفراندن، پێم وایە خاڵی جیاکردنەوەی تۆ و شاعیرانی هاوشێوەنووسی وەکو تۆ لێرەوەیە.



ئەنوەر: لە خاڵەکانی پێشوودا جەختم لەسەر ئەوە کرد؛ من هەمیشە گومان دەکەم لە دوا دیمەن و دڵنیاییم پێ نابەخشن. هەر بۆیە ئەو نادڵنیاییە و ئەو گومانە یەک لە دوایەکە بەفەڕانە.. دەشێ هۆیەک بن، وێنە لە دوای وێنە و خەیاڵ لە دوای خەیاڵ قەتارە ببەستن و تێریان لێ نەخۆم. فراوانبوونەوەی ئەو مەملەکەتانە و یەک بە دوا هاتنەکان فەراهەمکەری ئازادییەکانی منیشە. گەرەکمە لە مەسافەی جیاواز جیاوازدا بە نائاشناییەکانیان ئاشنا بم و.. ئەمەش زەمینە خۆشکردنێکە کە گەشتەکانی خۆمیان لەگەڵدا دەست پێ بکەمەوە و جارێک ئەوان ڕێنماییکەرم بن و جارێک من ڕێنماییکەر! جارێک ئەوان گۆرانیبێژن و جارێکی دی من گۆرانیبێژ. زۆرجاریش بە یەکەوە ئەو کۆراڵە دەسازێنین. وەلێ لەسەر هیچ یەکێک لەو حاڵەتانە بڕیارم نەداوە و خۆڕسکییانە خۆیان هاتوون. من بۆ خۆشم لەو بەرخوردە عەفەوییانە ورد دەبمەوە و، لە نهێنی ئەو خەیاڵ و هاندەرە شاراوانە رادەمێنم لەو چەمکە جیاوازانەی کە لە دەرەوەی ئیختیاری من کەرنەڤاڵە شیعرییەکە بە ئیرادەی سەربەخۆیی خۆیان دەخوڵقێنن. ئا هەر لەوێڕایە جارێکی تر من بە ئیختیارە راستەقینەکانی شوناسی خۆم دەگەمەوە و لە ناسینەوەیاندا بۆنی بەشێک لە وجودە خەفەکراو و بێ شوناسەکانی خۆمیان لێ دێت.

کە ئەم حاڵەتانە هاوکێشەیەکی هاویەک و لە هەمان کاتدا دژ بەیەکی وەها پێک دەهێنێت کە بۆ خۆشم سەیرە! دەڵێی فاڵێکە و بۆ نامۆگەرایی و کێشە کەینونی و دەروونی و مێژووییەکانی خۆمی دەگرمەوە.

تۆ بڵێی یەک بە دوایەک هاتنی ئەو وێنانە ئەوە نەبێت لە تخوبەکانی ئیرۆسیەت دانەبڕێم؟! تۆ بڵێی ئەم هەڵکۆڵینە بەردەوامە داینەمۆی زەین روونی روئیا شیعرییەکانی من نەبن؟ یاخود مافی قسەکردنی خۆیان بێت ئاوها بدوێن تا بزانین لە کوێدا بەیەک بگەین و لە چیدا لە یەکتر جیا ببینەوە و فاسیلەکانی نێوانمان مەرجی ئازادبوونی ئەوان و ئازادبوونی منیش بێت. دەشێ لە بارێکی تردا ئەو دیمەنە جیا جیا و یەک لە دوایەکانەی سەراب.. باران.. ئەستێرە..مانگ..نان. نیشاندەرەوەی نادڵنیایی و ناسەقامگیری لە مندا بەیان بکەن و خۆیان بە من دەنووسنەوە و ئەوجا پێم دەڵێن: ئەمانە وێنەی راستەقینەی ئێمە نین و بگەڕێ بە

دوای وێنەی ترماندا.

بەڵێ دەشێ گەرەکم بێت، دوا وێنە سرکەکەیان رابهێنم.. هەرچی دەکەم و دەکۆشم بۆم ڕام نابن! جـا ئەوەتا هەژاری منە.. یا لووتبەرزی ئەوان؟ لە سەرێکەوە شادمانیشم ئەمە لەو هەقایەتە دەچێت (کە باوکێک لەسەرە مەرگدا بە کوڕە تاقانەو کارنەکەرەکەی دەبێژێت: کوڕم بمبەخشە کە خۆم بە هەژار و دەستکورت پیشان دایت بەڵام ئێستا ناچارم پێت بڵێم.. لە زەوییە نەکێڵراوەکەماندا گەنجینەیەکم شاردۆتەوە، گەر بۆی بگەڕێیت بەختەوەر دەبیت.کوڕەش دوای مەرگی باوکی بە ناچاری و لەخۆشی گەنجینەکە دەکەوێتە ئەو جەنگەوە و بست بە بستی زەوییەکەی هەڵدایەوە و کێڵای کەچی هیچی نەبینییەوە..دواتر تێگەیی مەبەست لە گەنجینەکە کێڵانی زەوییەکە و بەرەکەتی دوای کێڵانەکەیە). پێ دەچێ هەڵوەدابوونەوەکەی منیش بۆ جوانترین و شۆخترین و سیحراویترین ئەو وەهمە شیرینە بن کە بوونەتە مایەی ئەم وێنە جیاجیایانە. لێرەدا جیاوازی من ئەوەیە زەوییەکەی من گەردوونە بێ سەرحەدەکەی ناو ناخی خۆم و وشە و مەحاڵاتەکانە تا بیکێڵم هەر تەواو نابێت. پێم وابێ بەردەوامی زیندەگیش ئەو تەواو نەبوونانەیە و (وجودیش لەو خۆشییەدایە کە لە ژیاندا هەوڵی بۆ دەدەین و پێی ناگەین -کامۆ-)

لە گۆڤاری ئاییندە - ژمارە ١١- ٢٠٠٠

## نارەتیف نێو وەهمە هەقیقییەکانی عیشق

هەر ساڵێک لەمەو بەر کە لە کەنەدا بووم، هیوا قادری شاعیر و هاوڕێم (بۆنی شەراب لە هەناسەم دێ)ی بە ئیمایڵدا بۆ ناردم، بە خوێندنەوەی کۆڵێک خۆشحاڵ بووم چونکە ئەو شارەی منی لێ بووم شانی بە ئۆقیانووسی پاسفیکەوە – ئارام– دابوو. ببینە ئەو رووبەرە واڵایە کە سەرفیرازە بە خۆکردنەوەی لەبەردەم نهێنی و سیحرەکانی خۆیدا. مناڵێکیش بە هەموو گەورەیی و بێگەردی خۆیەوە لەو کەنارە، دڵۆپێکی هەڵگرتۆتەوە و لەسەر لەپی دەستی ڕایگرتووە و لێی ڕاماوە تا ئەوپەڕی غەرقبوون لە ئەفسوون و جادووەکانی دڵۆپێک ئاو. دەشێ مناڵ بینەوە تا بەو سەرمەستییە بگەین. بۆ من.. هیوا و سەحەری نێو تێکستەکە ئەو دوو مناڵە عاشقەن. توانیویانە بەچاو قایمی خۆیانەوە نارەتیڤانە (کە پشت ئەستوورە بە موناجاتگەلێک لەگەڵ تێرمی خوداوەند و عیشق کە دوو داهێنراوی تەنیاییە وجودییەکانی مرۆڤ خۆیین) بێ خەیاڵ لە مەرزە ترادیشناڵەکانی – سوننەتی– بایەخ و دابونەریتە لە ڕۆح ئالاوەکان، کە لە گیاکەڵەیەک زیاتر نین بۆ زمانی ڕۆحە ئازادەکان. خۆیان ڕووت و قووت بکەنەوە لە پێشدەم سەفەرە بێ مروەت و بێ نەخشەکانی خۆیاندا و هێدی هێدی لە بەرەکەتی ئەو سەفەرە بەپێزەیان برننەوە (کە هێشتا زۆرێک لە نووسەران لە ترس و بە بەهانەی جۆراوجۆر خۆیانی لێ بە دوور دەگرن) و ئەگەر هەر نووسەرێکی تریش توخنی ئەو سێوی مەعریفە ڕۆحییە بکەوێت... یەخسیری دەکەن و هەزار و یەک تانەو تەشەرەی بۆ دادەتاشن.

بەڵام هیوا و سەحەر بێ ئەو گرێو گۆڵ و ڕەتاندنانە. سەربەستانە.. کە خاڵیە لە هەر تاوان و گوناهێک، سەربوردە و حەکایەتی عاشقانەی خۆیان بە شێوازبوونێک دەگێڕنەوە کە پاڵەوانەکانی ئەو خوازەیە خۆیانن) هەتا بشێ دۆستانە بە وشەکان بڵێن : توو چاوە بێ وەنەوزەکەی عیشق. شاهید بە بەسەر وشە شڕشێتەکانی ڕۆحە پەتیارەکەمانەوە . ئاخر ئێمە – من و سەحەر– لە تۆوە زمانمان گرتووە و.. لە تۆوە



لە خۆدواندن و ڕیسک کردنیش فێر بووین! (مرۆڤی ئاقڵ کاتێ ئاقڵە کە عاشق بێت، مرۆڤی بێ ئەقڵیش بۆیە بێ ئەقڵە چونکە وا خەیاڵ دەکاتەوە لە عەشق تێدەگات – پ. کۆیلۆ)

ئەوان دێن و لە ڕێگەی خۆ دەربڕین و خۆ نووسینەوە، شوناسێکی تر دەدەن بە خۆیان و، درێژە پێدەری هەمان ئەو سروتەش ritual دەبن کە ژیانپێدەرە و ڕێنوێنیکەرە بۆ ژیانێکی مەعنەوی. بە بڕوای (تۆماس مەرتۆنی ڕاهیب، ڕێگەی ژیانی مەعنەویش، جگە لە عەشق چ شتێکی تر نییە. نهێنی ئەمە دەشێ چی بێت..؟ لە ئینجیلی پیرۆزیشدا هاتووە (گەر بێت و بە هەموو زمانەکانی جیهان و فریشتەکان بدوێم، بەڵام خۆشەویستم نەبێ، ئەوە وەک گرمەگرمی دەهۆڵ و زیڕەزیڕی زوڕنا وام. گەر بێت و بە ناسکترین وشە بدوێم و هەموو نهێنی و زانیارییەک بزانم و باوەڕێکی وام هەبێ بتوانم چیای پێ هەڵکەنم، بەڵام ئەگەر خۆشەویستم نەبێ، ئەوا هیچ نیم. گەر بێت و هەموو سامانم بەسەر هەژاراندا دابەش بکەم و تا سووتان ژیانم پێشکەش بکەم، بەڵام خۆشەویستم نەبێ، ئەوا هیچ سوودی بۆم نابێ. خۆشەویستی دان بەخۆ گرتن و ڕۆح سووکییە، خۆشەویستی شانازی نییە، چاو پیسی نییە، لووتبەرزی نییە، خۆشەویستی توندڕەوی نییە، بەدگومانی نییە... خۆشەویستی لە هەموو شتێکدا هەدادانی هەیە، باوەڕ بە هەمووان دەکات و لە هەموو کاتێکیشدا ئومێدەوارە و بەرگەی هەموو شتێ دەگرێ. خۆشەویستی هەرگیز نافەوتێ. تۆزە تۆزە فێر دەبین و نەختە نەختە دەئاخڤین......... من ئێستا کەمێ زانیاریم هەیە، وەلێ ڕۆژی پەسلانێ بە تەواوی خواوەند دەناسم، هەروەک چۆن ئەویش من بە تەواوی دەناسێ. جا ئەوەی تا ئەو کاتە دەمێنێتەوە: باوەڕ و هیوا و خۆشەویستییە، ئەمانە سێ شتن، بەڵام خۆشەویستی لە هەموویان مەزنترە).

لە هەمان کاتدا ئەزموونێکیشە بۆ ئێمە، کە وێنەی خەڵکانی عاشق چۆن هەست پێ دەکەین و دەخوێنینەوە. لەم بوارەدا بەهەڵەدا دەچین گەر مەزنە بکەین، خەتایە ئەزموون کراو ئەزموون بکەینەوە. ساتەوەختێ بمانەوێ دەرهەق بەو شتەی دەیبینین بدوێین، ئێمە گەوهەر و حەقیقەتی ئەو شتە دەرناخەین، بەڵکو لەمەڕ بۆچوون و توانست و هەڵسەنگاندن و هەستەکانی خۆمان دەدوێین. ئێمە یەکێکین لەو چەندین

کەسانەی بە شێوەی تێگەیشتن و ڕەوشی خۆمان ورد دەبینەوە و ڕاستی دەبینین نەک نوێنەری ڕاستییەکان و ڕاڤەکارێکی برێنەرەوە بین، دەربارەی تێکست و کەسێتی و دیاردەکان.

دەشێ لێرەدا کۆنسێپتی مۆنادی لایبنیتز بە هانامانەوە بێت، کە پێی وایە هەر شتێک لە دنیادا تاکە. دوو شتی لەیەکچوو لە هیچ کوێ نابینی، هەر شتەی کەسایەتی خۆی هەیە. مۆناد پێمان دەڵێت: هەر ئەو تایەتمەندییەیە کە شتە جۆراوجۆرەکان ڕێکدەخات. بێ ئەوەی ئەم ڕێکخستنە پێش بە جیاوازی بگرێت یان ئەو جیاوازییە یەکپارچەیی هەڵبووەشێنێتەوە. هەر بۆیە وەکو فەیلەسوفی هارمۆنی دەناسرێ.

وە پێی وایە هەر بەشێکی مادە وەک باغێکی پڕ گیا یان گۆمێکی پڕ لە ماسی چاو لێ بکەین، بەڵام پەلکی هەر گیایەک، ئەندامی هەر گیاندارێک، یان دڵۆپەی عارەقەی لەشی، دەتوانێ باغێک یان گۆمێک بێت. هەموو ئەم مۆنادانەش بە یەک ناسازگار نین. چونکە بە بۆچوونی لایبنیتز: مرۆڤ بەسەرجەمی هەموو شت دادەنێ و سەرجەمی شتەکانی جیهانیش وەک تاکێک!

خۆشنوودم بەو ئازایەتییە، کە بێ پرینگانەوە بە ئێمە و زیندەگیان گوتەوە:

هاوڕێیانمان- دڵتەنگ مەبن. دڵ لەدواتانین... ئەمەش گوڵدانێکی تر لە عیشق لەبەر هەیوانی تەنیاییەکتاندا دابنێن، تا دڵتان بکرێتەوە!

ئەمە وەفایەکی جوانی سەحەر و هیوا بوو، کە عیشقی ژیانیان، تەنێ بە عیشق پەنا دا و وەڵام دایەوە.. ئافەرم!

ئاخر ئەوەی لە مانا قووڵەکانی - وەفا- نەگەیشتبێ، مەحاڵە مەحاڵ بتوانێ بۆ هەناسەیەکیش بێت عاشق بێت. عیشق لە نێو گێچەڵی هات و هەراکاندا یەعنی: وەفادار مانەوە بە زایینی بینینەکانی خۆمان. ئەو بینینەی لێیەوە لە تریفەی پەنجەرەیەکیەوە، کە پاشەکەوتێکە لە نوتفەی فەنتازیا سرکەکانمان گرتۆتەوە. هەست دەکەین ئیدی ئێمە کەسێکین ئاوێزان، لە ڕەنگی ئاونگی بەیانیانەکانی خۆمان. هەروەتر شتەکانیش ڕەنگێکی تر دەبن لە ڕەنگە جەربەزە و تەڕوبڕەکانی عیشق! کە لە نێوان مەوداو دەست تێکەڵاوکردنی ئاسمانی ئەقڵ و زەوی دڵدا هەموو



شتەکان بۆ نیگاکانی خۆی ڕادەکێشێ.

لە ڕەنگێ کە (نە لە کەس بووە و نە کەسی لێ دەبێت!)... لە ڕەنگی هەموو بێڕەنگییەکان گیرابێتەوە! لە دەنگی هەموو ئەو بێدەنگییانەش، کە چاوەڕێی فەیزی عەشقێکن بڕژێ بە سەریاندا.. تا بە کاوەخۆ بێنە وجود.

بەڵێ.. کیرکگاردیش وەکو (پارێزەرێکی بوون و ژیان) پێیوایە:

سەوداسەری (عیشق) قووڵترین نیشانەی بوونی مرۆڤە. هەر بۆیە ڕەوشی بێدەنگییە گەورەکان، لە ژانی عیشقێکی شێتانەدایە دێنە دەنگو بە کاوەخۆ دەڵێن: ئێمەش هەین

***

ئەوەبوو پێمگوتن: بە وردی - عیشقنامەکەتانم- خوێندەوە، وەکو ئاماژەکانی تێکستەکە پێمان دەڵێن: هەمان هەناسەی - سەفەرنامەیە- و دەشێ هەر ئیدامەی ئەو پرۆژەیەش بێ بە فۆرمێکی تر؛ تەنێ جیاوازییەکە لەوەدایە.. جاران هەر خۆت حیکایەتخوان بوویت، وەلێ ئەمجارە خۆشحاڵانە لەم ئەزموونەدا لەگەڵ سەحەرۆکەکەتدایت. ئەمەش بە کەمگرتن نییە. سەفەر نامە؛ سەفەرێکی ئەزەلییە و... لەو بڕوایەدانیم ئەوەی بە دوای شوناسی تری خۆیەوە بێت و بیەوێ نیوەچڵییەکان بڕستی لێ نەبڕن، قسەی نەمابێت بۆ وتن. بمبەخشە نە لە بری تۆ دێمە گوتن... نە بیرت بۆ دەکەمەوە... نە پلانت بۆ دادەنێم، بەڵکە ئەوەی هەڵخزابێتە بەلەمە ئەفسووناوییەکەی ئۆدیسیۆسەوە مەحکوم دەبێت بە سەفەرێکی سەرمەدی.

ئیدی تۆ پیاوێکی ئاسوودەیت. هیچ نەبێ حیکایەتەکان لێت ناگەڕێن چیتر بێ خەون و تەنیا و بێ تێشوو بیت. هاوڕێم دەزانم پێویستیت بەوە نییە کەس دڵت بشێلێت و دڵنیام پێویستیشت نییە و نابێ. هەروەکو چۆن کیرکگارد وتی: ئەگەر قەرار بێت ڕۆژێک لەسەر گۆڕم شتێک بنووسرێ، پێم خۆشە تەنها ئەوە بنووسن (فەردێک بوو). تۆش لە زیندەگیتا هەقتە پێت بڵێن: (عاشقێکە) یان (عاشقێک بوو).

وەکو هەنگێکی موسافیر و عاشق بە سیحری موزیکی زۆزان و گوڵستانەکان لە هەنگوینی ڕۆحی خۆت بخۆ.. نۆشی گیانت بێت. ئەوەی لە گوڵدا چاوی کردبێتەوە لە بۆن و ناسینەوەی جوانی و - مۆسیقای ڕووان- زیاتر ناز ناکات..!

ئەم سەرنجانە قسەی ناو ڕۆحمن. بۆ ئەزموون و شیعرگەلێک کە ئەم ڕاستییەم پێ دەبێژن و هیچیتر؛ هیوام وایە ناپاکیم لە سەلیقەی خۆم و قەڵەمی تۆش نەکردبێ!

لایەنی کەم ئەگەر وجود، هاتنەدەر بێ لە خود، بۆ خۆ تێپەڕاندن و ڕۆیشتن بۆ ئەوپەڕی تواناییەکانی خود. ئەم بەرهەمەشتان وا چاولێ دەکەم جۆرێکە لەو واوەتر چوونە، بۆیە دەبێ ببینرێ.

ئەگەرچی سەحەر خانمیش، هێندەی لە دەستی هاتبێ بوێرانە لە خەسڵەتی مێینەیەتی خۆی نەسڵەمیوە تا لێی هەڵبێ. دیارە زمانەکەی ئەمەم پێ دەڵێت.. بەڵام هەر هێشتا نەیتوانیوە هەندێ حاڵەت لە خۆیدا خەفە و دەمکوت نەکات! چونکە بە داخەوە مێینەی لای ئێمە، لەبەر زۆر هۆ.. بەس لە سووڕی مانگانە و بە دایکبوون و شیردانداندا لە سەداسەد توانیویانە خۆیان بن، دەنا هەمیشە ئەو قاڵب و وێنانە بوون کە دابونەریتی پیاوانە لێی خواستوون و وایان زانیوە لە مەزنییەتە ناچۆڕاڵیەکەی خۆیانەوە هەڵقوڵاون. گەر ئەو چەپاندنە ناچاری/ دەستکردانە نەبوونایە تێکستەکان پڕتر دەبوون بە سەما دەروونییەکانی خەیاڵی خۆیان و ڕۆشنبوونەوەیان بە دەرکەوتنی مەکۆی جوانی ئەو سەمایانە، ڕۆح خەنیتر دەبوون. بیرمان نەچێت وشەکان تا ئەو حەلە لەگەڵماندا هۆگر و میهرەبانن... کە لە ڕووتبوونەوەی دیمەن و ئابڕووچوونەکانی نەپرسینەوە. هەر ساتەوەختێ بە هەر هۆیەک بێت، سەرەڕۆیی و ئازادی وشەکانمان داپۆشی و لێنەگەڕاین: (بەپێی پەتی غەریزەکانی خۆیان پیاسە بکەن) ئەویش لێناگەڕێ هەموو مەملەکەتە نەبینراوەکانی خۆیمان بەرێ. بەشداریشمان لە وازییەکانی خۆی پێ ناکات، ئەو وازییانەی کە هیوا قادر زەفەری بە سروشتە سرکەکەیان بردووە و نەیهێشتووە هەموو لەرەکانی لە دەست دەرچێت!

چونکە وشە، هەناسە و نهێنییەکانی بوونیمان زیاتر لا دەدرکێنێ... کە ئامادەبین بە کەشیش و باوکی ڕۆحی خۆمانی بزانین و بێ سڵەمینەوە.. بێ هیچ پێشمەرجێ هەموو نیاز و نهێنییەکانمانی ڕاستگۆیانە بۆ بدرکێنین. لەو بڕوایەدام هەر کە چووینە بەردەمی وشەکان، مینا جادووگەرێک و بەختگرەوەیەکی ڕۆحدیدە و پەنهاندیدە، لەپی دەروونمان دەربەستانە موتالا دەکا و دەزانێ لە ژێرپێستی ڕۆحی ڕۆحمان چ ڕازێ دەگوزەرێ! جا هەتاوەکو بەر نەعلەتی جوانی وشەکان نەکەوتووین



با لە هیچ نەسڵەمینەوە تا لێمان نەسڵەمێتەوە و.. لە خێر و خۆشییەکانی مەحرووممان نەکات. چونکە لەو کاتەدایە وشەکان خۆمانن و خۆشمان وشەکانین. خۆتان نووسەرن و دڵنیام تێمدەگەن؟

***

سەحەری جوان.. سەحەری خوشکم، ئاگات لێیە وشە چ میهرەبانێکی دڵڕەقە و بێ ویستی خۆمان چ گاڵەیەکمان پێدەکات؟! وشەکان بۆ من لەو بروسکە شەڕەنگێزانە دەچن تا لە بەردەمیاندا، عاشقەڕووتانە ئامادە نەبیت بۆ هەموو سووتان و قوربانییەک، نایەڵن بە خوڕەم ببارێیت بەسەر وردە خودە نەناسراو و نەبینراوەکانی نێو خۆتدا، ئەمەیە مەرجی پڕ شەفەقەی وشەکان. وشە خۆشڕەوت و ڕوونبووەوەو بێ باکەکان. ئەمەیە ئایەتێکی ئەو ئیبلیسە بێگەردە!

چ چاکەکارییەکی مەزنە کە نسرمە بایەکی خۆشمەشرەف، جوانی فێنکاییەک بە ڕۆحماندا دەدات

(کە چوومە سەحرا عەشق باریبوو/

و زەوی تەڕ بوو/

وەک چۆن قاچ بە قوڕدا دەچەقێ، ئاوا قاچی من بە عەشقا دەچەقی -عەتار).

لێرەدایە بۆچوونەکەی گارتمان لەمەڕ هونەر کۆمەکمان پێدەکات کە دەڵێت:

(شتەکان لە خۆیاندا جوان نین، بەڵکە ئەوە هونەرمەندە دەیگۆڕێ بۆ جوانی)

بەڵێ ئەمەشیان چاکەکارییەکی ترە بۆ تێگەیشتن کە (عیشق نەزانین - سەحەر ڕەسایی-) بێ. مرۆڤ سووکەڵەتر دەبێت بۆ هەڵفڕین، لێ وردە بەردەکانی زانین قورسترمان دەکا!

ئاخر چی بکەین کە سێوی مەعریفەمان خواردبێ و تەنێ لە ڕێی زانینەوە بێت، بگەینە ئەوەی کە عیشق نەزانینە!؟ ئەمە ئەو موفارەقەیەیە paradox کە کیرککگارد بە مەحاڵ ناوی دەبرد. خودی عەشقیش مومارەسەکردنێکی مەحاڵانەیە.

چونکە (مەحاڵ: گوزارشتە لەو پەیوەندییە سەیر و سەمەرەیەی نێوان کاتە سەرمەدی و کاتە مێژووییەکان، نێوان خواوەندییەکان و زەمانییەکان - کیرککگارد).

مەحاڵ.. سۆزێکی کلێپەسەندووە کە - خۆراک دەدا بە فیکر و پێدەگەیێنیت- .
فیکریش کۆششی ئەوەیە لە خودی خۆی سەرووتر بچێ، بۆ گەیشتن. گەیشتن بە سنوورەکانی نادیاری - مجهول - ئەو نادیارییەی ناوێکی تری مرۆڤ نییە، وە شتێکی ئیزۆتریکی - باگنی- نییە، یا بۆ ئەو جیهانەی ئابڵوقەی داوە. بەڵکو ئەو نادیارییە، نەشیاوە؛ جگە لە خوداوەند شتێکی تر بێت! گەرچی ئەلبێر کامی گەلێک سەرسام بوو بە پرۆسەی ئەو دۆزینەوەیەی کیرکگارد بۆ مەحاڵ، بەڵام بۆ دەرئەنجامەکەی لەگەڵیدا یەک نەهاتەوە و تەبا نەبوو. کە لە دواجاردا مەحاڵ لە خودا زیاتر نەبێ و تەنها گوزارشت بێت لە جیهانێکی تر، ئەقڵ دەبێتە قوربانی و لەلایەن دینەوە سەر دەبڕێت ئەم حاڵەتەشی ناونا : خۆکوژی فەلسەفی.

ئەوەی پەیوەندی بە باسەکەی ئێمەوە هەیە پوختەکەی لەم نمایشە فیکری فەلسەفییەدا خوداوەند و ئەقڵە.

لە خوێندنەوەم بۆ ئەزموونی هیوا دێمەوە سەری. بەڵام ئەم نمایشە پێمان دەڵێت: ئەقڵ بە قەرەبووکردنەوەی زانینەوە ئەقڵە و چاودێری خۆیشی دەکات. بۆیە ئەگەر (عیشق نەزانین بێت) لای سەحەر ڕەسایی، بۆ خاتری ئەوەیە خاترجەم و ئەرخەیان بیت لەوەی (هەمیشە ئەو عەشقانە ئەمێننەوە کە نازانی بۆچی و لەبەر چی عاشقی - سەحەر- ل ١٣٩) ئەمەیە ئەو موفارەقەیەی لەسەرەوە ئاماژەمان پێ کرد: دڵنیایی و نادڵنیایی، سەرمەدی و کاتی، وەلێ چی بکەین لەو مەحاڵە/ موفارەقەیە کە تۆ هەڵوەدای ئاسوودەیی سەرمەدییانەی لە (مانەوەی عیشق) و مەحاڵیش بە ناسۆرییەکانییەوە ئەوەیە کە هەیە و لە عەشق جودا نابێتەوە. نەک ناوە ناوە بەڵکو (ئاسوودەیی و مەحاڵ فرزەندی یەک زەمینن - کامی-).

ئەم پرۆسێسی نەزانینە تەنها بۆ پاراستنی عیشق، لە دەست نەشتەرگەرییە بێ ڕۆح و کتوکوێرەکانی دەرەوەی خۆی دەشێ بەسوود بێت! ئەگەر نا بە خۆمان نییە، ئێمە نیشتەجێی بەرزەخی نێوان زانین.. نەزانین و، ئەمانیش سانا دەستی مەحاڵیان پێڕادەگات. ئەو مەحاڵەی فیکرمان ئاوەدان دەکاتەوە! ڕەوشی مەحاڵیش ئەوەیە تەنها گوێ لە خۆی دەگرێ... نەک تەمەنناکانی ئێمە! بیریشمان نەچێت (عیشقی ئۆنتۆلۆژییانەش) دڵنیایی و بێوەییمان پێ نابەخشێ، ئەمە جگە لە خەونێکی



ڕاگوزەر.. لە واقیعدا ڕاست ناسەلمێ و بەجێ نایەت. خۆ وامان دانا عیشقی ئۆنتۆلۆژیش بە دەست دێت، شتێک نابێت جگە لە ڕیزاڵ ڕیزاڵ بوونمان زیاتر. چونکە قایلبوون بەو عیشقە ئۆنتۆلۆژییە لەگەڵ خۆیدا بەرەو پەککەوتن و بە سالاچوون و لەت لەتکردنمان دەبات.. کە هەمیشە ئامادەبین بۆ قوربانیدان، کە دەکاتە خۆکوژی. لە لایەکی تریشەوە ئالوودەمان دەکات بە دژایەتییەکانەوە___ تناقض___ دژایەتی خەونی بێ پایانی ئەفلاتوونی و جەبری سنوورەکانی واقیع. کە لەگەڵ خۆیدا شالاو بەپێچەوانەی ڕۆمانسییەتەکانی ئێمەوە دێنێ و ڕۆتین دەژێنێ. ئەو ڕۆتینەی هەڕەشە لە نەزۆک کردنی عیشق دەکات! دەبێ ___ بزانین___ تەنها بە گڕا چوونەوەیەکیش. دانەبڕانی عیشقە لە لەحزاتە حەقیقییەکانی خۆی، ئەو ساتەی کە تیایدا دەژی، کە ساتە ڕاستەقینەکانی دڵخۆشبوون و بووژانەوەی عیشقە. (هۆشیاری بەو لەزەتی لەحزانە بوو، دۆنجوانی کرد بە یەکێک لە پاڵەوانەکانی مەحاڵ - کامی-) کەوابێ پێداگری لە مانەوە.... تەنێ واتادارکردنی ئەو لەحزانە و مانەوەی ئەو لەحزە بێ سەر و بنانەیە، کە تژیین لە سەرمەدییەت. نەک کەمبڕشتکردن و چاونووقان لێیان و نەزانینیان!

چۆن دەڵێیت: (ژیان یەعنی ئەم دێرەی کە ئێستا ئەینووسم - سەحەر- ل ١٤٩)

عیشقیش یەعنی: ئەو لەحزەیەی کە ئێستا تێیدا دەژیم.

سوپاسگوزارم گەر لەم وەسوەسانەم ببوورن.. بە خاچی مەحاڵەوە! چونکە ناچارین بزانین (چارەی مەحاڵ، مەحاڵ خۆیەتی -نیچە-)

***

# زمانێکی ڕۆشن بووەوە.. بە پەنهانییەتەکانی خود

هیوا قادر

(... خودایە لە کاتی فڕیندا بە ئاسمانەوە بمکوژە/ یا لەگەڵ
چەخماخەیەکدا لە چاڵێکدا بمنێژە/ یا لوولکە بەقەدی درەختێکەوە/
تا لە بەرزاییدا هەناسە بدەم... - هیوا-)

زمان: ئەم هەژارە دەوڵەمەندە، ئەم جەللادە بەخشندەیە، ئەم نهێنکارە ڕوونە، ئەم پیرە منداڵە، ئەم تاریکییە ڕووناکە: یەکەمین خۆکوژی لەوەوە داکەوت. چونکە پێیوایە..

(ئەگەر کاتێک ناتوانی لەسەر شتێک بدوێی، باشترە بێدەنگ بی -ڤیتگنشتاین-).

لێ ئەوە هەیە خۆکوژی زمان وێکچووی خۆکوژیی بوونەوەرکانی تر نییە. چونکە لە خۆڵەمێشی بێدەنگبوونی خۆیدا هەڵدەستێتەوە بۆ سەفەر لەسەر زاری ئاواز و دەنگ هەڵبڕینێکی تر. کە هیچ لە سەفەرەکانی تری ناچێت...، ئەم سەفەرانەش کە لە دوای هەر هەڵسانەوەیەک لەخۆڵەمێش ڕوودەدات ناوی - شیعرە- بە هەق ئەوەی ئەم فێڵەشی کەشف کرد، شاعیر بوو! هەر بۆیە سەیر نییە بەڵکە جێی تێڕامانە کە وتراوە شاعیرەکان خوداوەندیان ئافەریدە کردووە. (خوداوەندکان گشتیان، مەجازەکانی شاعیرانە و فریوەکانی شاعیرانەن -نیچە-) جا لەبەرئەوەی خوداوەند، بۆ ئەبەد ئاوازەکانی بە نەمری بمێنێتەوە؛ ماڵێکی بۆ خۆی هەڵچنی لە مەلەکوتی نادیاری! بۆیە هەر خەیاڵپەروەرێک، ئەندێشمەندێک، لە جابوڵقاکانی نادیاریدا بمێنێتەوە و موسافیر بێت و خەریکی کوشتنی ئەو وردە خودانە بێت، کە دەست و پێگرن لە بڵندبوونەوەی خودێتییە بەهێزەکەیدا، هەتا بگاتە ئەو مەلەکوتە کە تیایدا دەگاتە خودی ڕاستەقینە. دەشێ خود خاوەنی دەستێک بێت کە توانای دەست لێدان و بیستنی زایەڵە دەست لێ نەدراوەکانی خوداشی هەبێت. ئەگینا خوداوەند بە خودێکی پەتەڕی، نە ڕام دەبێ نە تەماهی دەبێت! جا لەبەرئەوەی:

(سیزیفێک لە ڕۆحی هەر یەکێکماندا دەژی هیوا- ل١٢٠) هەر ئەوەشە لێناگەڕێ



لە مەنزڵ و حەساوگەیەکدا بۆ ئەبەد ئۆقرە بگرین. چونکە پێمان دەڵێت:

(گەر سیحری ئەم هێزی گەڕان و پرسیار و بەردەوامییە نەبوایە ئێمە هەرگیز لە سەرەتاوە فەلسەفەمان نەئەناسی، میتۆلۆژیاکان نەیانئەتوانی تا ئێستاش بە سیحری خۆیان سەرسامان بکەن - هیوا- ل١٢١) لێ مەخابن.. ئەم خودە کامڵ و نادیارەش نە پێیدەگەین.. نەدەیناسین! کەچی بە ئەفسانەکانی دڵخۆش و هەندێ جار ڕازین چونکە ئەم هەڵگەڕان و داگەڕانە سیزیفیەیەتی سەرسامان دەکات! ئایا سیزیفێک کە بەر نەعلەت و تووڕەبوونی خواوەند کەوتووە و ئەو ئازارە دەکێشێ بۆ ئەوەیە لە دواجاردا ئاسوودە بێت؟ نەخێر، لە زمانی کامییەوە دەیبیستین ئەوەیە: (ئەوەی دەمەوێ ئەوەیە هۆشیار بم!) ئەم نهێنییەیە نایەڵێ لە حەکایەتێک و لە عیشقێکدا باڵی فڕینمان دابخەین و بڵێین ئیتر سەفەر تەواو. ئەمە چ فێڵێک بوو بۆ خۆمانمان دروست کرد، هەم دەبەزی و هەم نابەزی.. هەم دەگەیت و هەم ناگەیت؟! بۆچی زەینمان ناچێتەوە سەر ئەو جێیە عاسیانەی ئەندێشە، کە بردینی و زیندەگیمان لە ئەفسانەگەلێکەوە بۆ دزی کە لە بوێرییە شەڕانییەکانی ئەو بایە دەچێت کە پەستراوەتە، تووڕەکەکەی پاندۆراوە و گەر بێتە دەرێ دنیا ژێرە و ژوور دەبێت. شاعیران ئەو کاشفە بوون لەگەڵ خوداوەندیشدا، عیشقیشیان ئافەریدە کرد، لە قوڕی تەنیایی و، ئاوی ڕۆح و، ئاگری ئەندێشە.. هەر بۆیە (ئەم هەموو جوانییانەی کە ئێستا مرۆڤ خاوەنییەتی هەموویان هی عەشقن -هیوا - ل ١٣٣).

ئەو ڕووبەڕووبوونەوانەش لەگەڵ لە مالایەعنی یا یەعنی- (مێژووی عەشق مرۆڤ خۆیەتی، ئێمەین -هیوا-) ئەم هەموو ڕەنجی فەرهادە بۆ...؟

فێجا نازانی (عەشق گەڕانە بەدوای ئاسوودەییدا- هیوا-).. (ئاسوودەیی تۆ لە کوێی؟/ ئەم هەموو عاشقە بە دوای تۆدا ئەگەڕێن و ناتدۆزنەوە - هیوا-). کەوابێ ئەو دەستەی - خوداوەند و عیشقی- لە دەروونی ژانگرتووی شاعیر هێنایە دەرێ هەڵوەدا بوونە بە شوێنپێکانی ئاسوودەییدا! لێرەوەیە دەرکی ئەو نزا؛ لوغزاوییەی هیوا قادر دەکەین (ئەم فێڵە چی بوو لە ئینسانت کرد!) ئاخر بیرمان نەچێت یەکەم خەتاکار مرۆڤ بوو) چونکە خوداوەند لۆگۆسی- ئەقڵی- ئەوە! ئەگەر وەها نییە....

ئەی بۆ بێ گیان و ئاژەڵ و ڕووەک ئەم لۆگۆسەیان بۆ غوربەتەکانی خۆیان نەخوڵقاند؟! پێ دەچێ هەر ئەمەش بێت، بنج و بناوانی - داستانەکەی سیزیف- کە

هەڵگرتنی بەردی لۆگۆسە..بیرکردنەوە.. تەئەموله ؛ ئەم دراماگەلەش لە دوورگەیەکدا خۆیان نمایش دەکەن، کە پێ دەچێ: عیشق یا خوداوەندبێ، هەربۆیە:

(خوداش دەفەرمووێ.. ئەوەی بە دوامدا بگەڕێت، دەمدۆزێتەوە/ ئەوەش بمدۆزێتەوە) دەمناسێت/ ئەوەش بمناسێت) خۆشی دەوێم/ ئەوەش خۆشی بوێم، خۆشم دەوێت/ ئەوەش خۆشم بوێت، لە ناوی دەبەم/ – نیکۆس کازانتزاکیس) لەناوبردن لە نێو هەڵاتنی پرشنگی ماناکانی خۆتدا. کە خۆریش لە ئاوابوونی ماناکانی نزیک دەبێتەوە، ئیدی بێ ماناییەکی تر سروود و دروودەکانی خۆی دەچڕێ. ئەم کارلێکەی ڕووناکی مانا و، تاریکی بێمانایی (قووڵترە لەوەی کە ڕۆژ بیری لێ کردۆتەوە –نیچە–) هەنووکە کە مەرزی تاریکییەک دەبەزێنین بۆمان ڕۆشن دەبێتەوە.. ڕۆشنبوونەوەی ئەم زمانی نزایەی هیوا لە چیدایە (خودایە لە کاتی فڕیندا بە ئاسمانەوە – بمکوژە– / یا لەگەڵ چەخماخەیەکدا لە چاڵێکدا بمنێژە– / یا لوولکە بە قەدی درەختێکەوە، تا لە بەرزاییدا هەناسە بدەم– هیوا ل٣).

خوداوەند: لۆگۆسە و.. وشەیە. وشەش گەورەترین داهێنراوی مرۆڤە (شیعر و ئاینیش دوو داهێنراوی منداڵێتی مرۆڤن –مارکس–) شاعیریش منداڵێکە گەورە نابێت! بەڵام کێشەکە لەوەدایە، کە مرۆڤ منداڵێتییەکەی وەلا دەنێت و گەورە دەبێت بە ئەقڵ. ئەقڵیش تا ببووژێتەوە و سەرمەست بێت بە گومڕاییەکانی خۆی، هێندە پاوانخوازە، ئەوەی خۆیشی ئافەریدەی کردووە دەیکوژێ! وێ دەچێ ئەمەش – ڕەگێکی تری بەردەکەی سیزیف بێت؟ چونکە مرۆڤ شاعیران– ئەو خوایەی خۆی هەڵیبڕی و بڵندی کردەوە – ترانسێنتنداڵ– هەر خۆیشی دایدەگرێتە خوارەوە – واتە– خلبوونەوەی ئەو بەردەی لە بڵندیدا بوو.. بۆ کەنارەکەی.

خولاسە مرۆ بە دەستی خۆی ئەو خوداوەندەی کوشت– نیچە– کە بە دەستی تەنیاییەکانی لەسەر وێنەی خۆی ئافەریدەی کردبوو. هەنووکە مرۆ بێ پشتیوان و بێ فریادڕەس مایەوە. ئەی چی بکات لە تەنیاییە ئەزەلییەکەی خۆی؟ ناچار دەبێ بە خۆڵەمێشی خوداوەندە کۆنەکە خوداوەندێکی تر ئافەریدە بکاتەوە کە لە دەنگ و ڕەنگ و بۆی ڕۆحە سەرگەردانبووەکەی بچێت تا ئاسوودە بێت! هات و عیشقی کردە ئەڵتەرناتیڤی تەنیاییەکەی خۆی، تا ئەوەی بە کوشتنی خوداوەند لە دەستی دا، لە عیشقدا بە دەستی بهێنێتەوە. بەڵام ئەمجارەیان– خوداوەند و عەشق – جیاوازیی



وێنە و وێنا کردنەکەیان لەوەدایە، خوداوەندی جاران خوداوەندی هەمووان بوو بێ جیاوازی...، کەچی عیشق ئافەریدەکردنەوەی خوداوەندەکە لە خۆڵەمێشی ئەو، لێ ئەمجارەیان بۆ هەمووان نا، بەڵکە بۆ خودێکی تاک و تەنیا و بەس. هەر بۆیە (عاشق هەمیشە تەنیایە – سهرابی سپهری–)

ئیتر ئەو فێڵ و فریوە جوانەی لەمەودوا، ڕازاندنەوە و هێنانە زمانی ئەم خوداوەندە تازەیەیە، کە دەبێ لە خۆی بدوێت و بە موعجیزە موتەعالییەکانی سەرمەست بین، هەتا بە سەروەت و بەرەکەتێک کە لەوەوەیە، ئاسوودەییەک دەست بخەینەوە و بڕژێنینەوە بۆ تەنیاییە هەتیو کەوتووەکەمان (ئەوەی کوپەی شەرابی خۆش کرد عاشق بوو/ ئەوەی یەکەم دووکەڵی مەستی هەڵمژی عاشق بوو/ ئەوەی یەکەم نامەی نووسی عاشق بوو/ ئەوەی یەکەم گۆرانی وت عاشق بوو/ ئەوەی یەکەم جار سەمای کرد عاشق بوو/ ئەوەی یەکەم جار گریا عاشق بوو/ ئەوەی یەکەمین جار توانی ببووری بە بێ هیچ مەرج و بەڵێنێکی پێشینە عاشق بوو/ ئەوەی یەکەم مۆمی دروست کرد عاشق بوو/ ئەوەی یەکەم جار وتی ئەستێرەکان جوانن عاشق بوو/ ئەوەی یەکەم دێری شیعری نووسی عاشق بوو/ – هیوا– ل ١٣٢) گەر– خوداوەندێک/ عیشقێک– هێندە هیدایەت بەخش بێت، ناچارین بە زمانی وجودی خۆماندا بیخوڵقێنین و لە دووی هەڵوەدا بین و بیدۆزینەوە و بە وێنەی تەنیاییەکانی خۆمان دروستی بکەینەوە. لەو میانەشدا زمان شتێک نییە جگە لە لۆگۆسی خودی خۆمان زیاتر. بۆیە دەکارین بڵێین، بەڵێ هیوا قادر؛ زمانێکی ڕۆشنبووەوەیە..... بە پەنهانییەتەکانی خودی خۆی! خودێکی تاک و تەنیا هەر داژوێ و، دەڕوا و ناگا بەهیچ، تەنێ وشە نەبێت. وشەش دەشێ خوداوەندا و عیشق و گەڕان و دەمامکەکانیان بێت! گا خۆتی پێ دروست دەکەیت، گا خۆتی پێ وێران دەکەیت!! ئەرێ عیشق و خوداوەند ئەم قامچی و پاسەوانەن کە سیزیفی ناو ئێمە وەفادار دەکەن، بە هەڵبەزین و دابەزینێکی ئەزەلی....

– آلبير كامي، محاولة لدراسة فكرة الفلسفي– دكتور عبدالغفار مكاوي–
– فیلسۆفەکانی مۆدێرنیتە، بێرتران ڤێرژۆڵی. و: محەمەد ڕەحیم ئەحمەدی
– بۆنی شەراب لە هەناسەم دێ – سەحەر ڕەسایی، هیوا قادر
– لە کەناری ڕووباری پیدرادا دانیشتم و گریام –پاولۆ کۆیلۆ– یاسین عومەر.

## ژیان دڵۆپی ڕژاو و مردن بە هەڵمبوونێتی؟

سازدانی: ئیدریس عەلی

*** مەرگ پانتاییەکی فراوانی لە شیعری نەوەی تازەدا داگیر کردووە، ئایا مەرگ کۆتایی بە شیعر دەهێنێ یاخود تەنها بابەتێکە و شاعیر بیروباوەڕی خۆی لە بارەوە دەردەبڕێ؟**

مردن نوێنگەی هەموو شتێکە. یا کانیباڵێکە بە قوڵپێوانە یا تەسکپێوانە، سەخاوەتمەندەکانی خۆیەوە بێبڕانەوە؛ هەر جارەی شتێک دەکاتە پارووی گەمە جوان و دزێوەکانی خۆی. گا ئەم کردارە دڵخۆشمان دەکات گا دڵمان دەگوشێ! سەفەرێکە گا خۆمان ڕێکی دەخەین بەر لەوادەی خۆی؛ گا خۆی ڕێکی دەخات بەر لەوادەی ئێمە! بەڵێ مردن بە هەموو گرێکوێرە ڕۆشن و نارۆشنەکانییەوە.. هێشتا دەکارین وەک تێکستێ کە نیوەی لە سەراب و نیوەکەی دی لەواقیعی حاڵدایە؛ بە دیارێکی نادیار ناوزەدی بکەین. چونکە دەبینین ئەمە جەستەیەکە و دیارە کە ناچێتە ژوانگە بۆ ڕاموسین و تینوێتی شکان بە سیحری یارەکەی.. بۆنی گوڵی سینەی ژیان ناکات و، ڕایەکمان پێ ناڵێت دەرهەق بە جوانی و ناشیرینییەکان؛ چیدی تووڕەبوون و پێکەنین ناز ناکات. ئەم فیگەرانە، لەخۆیاندا دەبنە باعیسی ئەوەی چەند نادیارییەک بە ڕووماندا بدەن و قیت بکەنەوە؛ کە:

+ داخوا ئەم دوو دیوییەی دیار و نادیار دەرهاویشتە و خوڵقاوی فینۆمینیایەکن؟

(لە بوون – بۆ– خۆ) کە توانای چالاکییەکانی فرە فۆرمن و.. دەگۆڕێ بۆ (بوون – لە– خۆدا) کە توانای چالاکییەکانی جگە لە تاک فۆرمی شتێکی تر نین و نابن؟

بەو واتایەی ژیان فرە فۆرم و فرە ڕەهەندە و مردن پێچەوانەکەیەتی...؟

+ داخوا بەربوونەوە بۆ ناو ژیان ئیختیارییە و مردن جەبرە؟



ئیختیار و جەبر چەندێک پەیوەندییان بە زەروورەتەوە هەیە

– زەروورەت– بە مانا وجودی و ناچۆڕاڵیەکەی؟

+ ژیان دڵۆپی ڕژاوە و مردن بە هەڵمبوونێتی؟

ژیان سەفەرە و مردن سکوت و سکون – ؟

ژیان خەونێکی کۆمەڵایەتییانەی دەرەکی و مردن خەونێکی تەنیاییانەی ناوەکییە؟

ژیان بەستنی پەیماننامەیەکە لەگەڵ ڕابردوو و ئێستا و ئاینده و، مردن هەڵوەشاندنەوەیەتی؟

+ تەنهایی ئاوڵەمەیی لە ئاودا ژیانە و، تەنهایی نێو گڵکۆ لە خۆڵدا –مردنە– ، ئەمە دەمانخاتە بەردەم نهێنییە فیزیکی و میتافیزیکییەکانی نێوان خۆڵ و ئاوەوە؟

+ ژیان نامۆیی و ڕەنجە و، مردن ڕزگاربوونە لێیان؟

+ ژیان بەخششێکی مردن و مردنیش بەخششێکی ژیانە؟ یاخود.. هەردووکیان لە یەکتری کەوتوونەتەوە؟

+ ژیان بە فۆرمە کۆمەڵایەتییەکانییەوە سەرمەدییە و، مردن بە فۆرمە ناکۆمەڵایەتییەکانییەوە سەرمەدییە؟ لەم حاڵەتەدا بەهاکان دەکەونە کوێوە؟

ئیدی ئێمە لە بری مردووەکان بیر دەکەینەوە و بەهایان پێ دەبەخشینەوە؟

* گرنگی مەرگ لەوەدایە : ناچارمان دەکات قبووڵمان بێت کە وزە شاراوەکانی زیندەگی لە خۆماندا بپشکنین و بدۆزین و بناسین و سەرمەست بین بە جادوو و سیحرەکانی؟

واتە مردن ڕۆڵی بەردەرباز و دیدەبازێکمان بۆ دەنوێنێت تا لەو زەمەنە کورتەی لە بەردەمماندایە، کە ناوی ژیانە... بمانپەرژێ ئاسوودەیی بنیات بنێین و وجودمانی پێ بتەنین؟

مەرگە دەمانخاتە جووڵە تا مەرزەکانی ببەزێنین و... هەر بە دەستی نادیاری خۆی، ئیرۆسیەتە شاراوە و خەوتووەکانمان تیا بەخەبەر بهێنێتەوە و ئاو بدا؟ داخوا لێرەدا ژیان و مردن جیاوازی تەکنیک و ئاراستەی جووڵەکان دەبێ؟ یاخود ژیان

بردنەوەیەکی تەمەنکورت و مردن دۆڕاندنێکی ئەبەدییە؟

+ مردن دەرگای داخراو و ژیان دەرگا ئاوەڵاکانە؟

+ ئەو دەمــەی لە ژیانداین ســەر بە مــێــژووین و ئەو دەمــەی مــردووین ســـەر بە میتافۆرین؟

* داخوا مردن بوو یاخود ژیان بوو خوداوەندی ئافەریدە کرد؟

واتە لە دوای مەرگەوە وەستاین و بیرمان لە کردگار کردەوە، یان چۆن چۆنی بوو؟ کامیان هەوێنی بیرکردنەوەمان بوون؟

+ داخوا ژیان سەر بە مەملەکەتی ئازادییە و مردن کۆیلەتی،
ژیان فراژ بوونە و مردن خەسیوبوون،
ئەی بۆ نیشاندانی سنوورەکانی مەرگ و ژیان، ئاخافتن و
نائاخافتن دەبێتە پێودانگ؟ گەر مەرگ نیشتمان بێ، ژیان تاراوگەیە؟ ئەی ئەگەر مەرگ بێدەنگییە، چۆن چۆنی دەبێتە مۆتیڤ بۆ دەنگ دەرهاتنەکانی ئێمە؟

+ داخوا ئەنکسمەندەر گوتەنی (٦١١– ٥٥٧ پ. ز) هەر جیهانێک کە دێتە کایەوە، دەبێت باجی هەڵەی لەدایکبوونی بدات، ئەویش کە لە ناوچوونە، دەبێت لەناو بچێت بۆ ئەوەی جیهانێکی دیکەی نوێ بێتە کایەوە، ئەمەش پێویستییەکە لە کردارێکی دادپەروەرانە؟

چەندین پرسیاری رووخێنەر و دروستکەری بێ پەیتر کە لە دواجاردا دەبنە ئەو فاکتەرەی مرۆڤیشی پێ بناسینەوە، چونکە پرسیار کردن خەسڵەتێکی تری مرۆڤبوونمانە لە پاڵ زمان و بیرکردنەوە و.. تاد

لێرەوە دەشێ مردن هەروەک ژیان بە یەکێک لە پرسیارە کۆن/ تازە کان ناوزەدی بکەین، واتە چییەتییەک کە کۆنبوون نازانێت. تۆ هەناسە دەدەیت مردن ئامادەیی هەیە.. لە سێکسدا ئامادەیی هەیە.. تۆوێک دەنێژی ئامادەیی هەیە.. لە رامان و رۆئیای شیعریدا ئامادەیی هەیە.. لە هەموو جێهێشتن و گەیشتنێکدا ئامادەیی هەیە! ئیدی شاعیر چۆن دەتوانێ خۆی ببوێرێ لە شتێک کە لەگەڵ ژیان و



لەدایکبوونی خانەکانی لەشیشدا برابەشن؟! شاعیر خۆی کە لە بانگەشەکردنی مەرگی مانایەکی کۆن و تاکرەهەندا دەستی هەیە بۆ خاتری لەدایکبوونی مانای نوێ و فرە رەهەندی تر... داخوا ئەمانە مەرگ نین.. داخوا ئەمانە مەرگێکی جوان و پێویستن؟

وێ دەچێ جوداوازییەکان لە خوێندنەوە و بینین و گۆشەنیگای تێگەیشتنمان بێ بۆ فۆرمە جوداکانی مەرگ. لە رووی مۆراڵی و ئیستاتیکی و بایۆلۆژی و کۆمەڵایەتی و فەلسەفی و.. تاد

دەشێ لێرەوەرا دووفاقی مەرگدۆستی و ژیاندۆستیش سەرهەڵبدەن و پیرۆزی بدەن بە سەنگەر و جەنگاوەرەکانی خۆیان. شاعیر دەرگایە و گشت ئەم شتانە بەناویدا رەت دەبن و پێیان ئاوس دەبێت. یەکێک دەبێژێت: (مردن فریام کەوە ژیان کوشتمی) یەکێکی دی دەبێژێت (مەرگی وا ناگۆڕمەوە بەسەد ژین).. (ژیان زنجیرەیەک خۆکوژی جێبەجێ نەکراوە).. (ئازادی یا مەرگ).. (تەنها ئیمتیازێک لە مەرگدا هەبێت نایەڵێ جارێکی تر بمرینەوە)... مردن کتێبە و بەدوایدا سۆراغی کتێبەکانی زیندەگی دەکەین و یاخود بەو شێوەیەی گەرەکمانە دەیخوێنینەوە و جارێکی دی دەینووسینەوە؟

ئایا نەوەی کۆن و تازە بەربوونەوەیان نییە بۆ ناو قەدەرێک کە خۆیان دەستیان تێیدا نییە؛ وە بۆ رزگاربوون لەو قەدەرە دەشێ جورئەتی رووبەڕووبوونەوە و چاوتێبڕینی بەرزەخە سەرابی و دانەسەکناوەکانی مەرگمان هەبێت، لەبەرئەوەی هەیە.

ئەوەتا کۆمیدییانە و تراژیدییانە دەبینین مەرگ و ژیان لە دەرەوەی واوەیلا و هەلهەلە کێشانەکانی ئێمە، لە یەکتر هەڵدەقووڵێن و دەچنەوە ناو یەکتر. بە ناچاری دەکەوینە نێو مەنگەنەکانی ئیختیارو جەبرەوە؛ جا بۆ ئەوەی لە مەرگێکی دزێو رزگار بیت دەشێ یەکێ لە پەرژاندنەکان ئەوە بێت باوەش بکەیت بە مەرگێکی جواندا و، هێندەی دەرەقەتی دێیت جەبرەکانی بگۆڕیت بە جۆرێک لە ئیختیار و بینووسیتەوە هەر یەک بە ئەدەواتی خۆیەوە؟ بڕوام بەوە هەیە بەقەد ژمارەی مرۆڤ و ئەستێرەکان مەرگ هەیە! جارێک ئەو بابەتی لێکۆڵینەوە و تێرامانە بۆ ئێمەی مرۆڤ و جارێک

ئێمە بابەتین بۆ ئەو. هەردوولا مانا و بێ مانایی دەبەخشین بە یەکدی و مانا لە یەکتر داگیر دەکەین. ئەی ئەوە نییە یەکتر بەرهەم دەهێنینەوە و لە هەوڵی ئەوەداین ڕێگەکانی یەکدیش ئاشکرا بکەین کە داشەکان چۆن دەکەونە جووڵە؟ دەشێ کەسێ ئەبیکۆرییانە بێژێت: (مردن پەیوەندی بە ئێمەوە نییە. چونکە تاکاتێ کە ئێمە بوونمان هەیە، مردنێک بوونی نییە و کاتێکیش کە مەرگ دێت، ئیتر ئێمە بوونمان نییە!) ڕاستە گشت ڕوانگەکان ڕێژەیین، بەڵام چەند بەو ڕێژەییانەش ئاوس بین (لێ درەختێ بیەوێ هەڵگژێ بەرەو سەرەوەی خۆی ناتوانی چاو لە باهۆزەکان بنووقێنێ) ئەگەر لە ڕوویەکەوە مەرگ کۆتایی بە هەموو شتێک دەهێنێت ئەوا لە ڕێگەیەکی ترەوە کە جێ پەنجەی بەردەوامبوونی پێوەیە، لەوە زیاترمان لە دەست نایەت جەبری تاک فۆرمییانەی مەرگێک بگۆڕین بە کۆمەڵێ فۆرمگەلی تر. نووسین یەکێکە لەو ئیختیارانە / فۆرمانە کە پارێزگاری لە سووسە کردن بۆ جوانییەک پێدەکەیت کە بە ڕەوای نابینی بوونی بۆ ئەبەد بسڕێتەوە، چونکە هەست بەتازەبوونەوەی ژیانێکی تیادەکەیت کە بارگاوییە بە ویستگەلێکی خۆت.

تێکست ئەو مەملەکەتەیە دەبێتە فریادڕەسێک بە دەوری ئەو جوانییەدا کە دەتوانێ مانەوەی خۆی بە دەستی سووسەکەرە ڕۆح زیندووە جوانەکان مەیسەر بکات.

لێ بە هەموو دەرئەنجامە قبووڵکراو و قبووڵ نەکراوەکانەوە، لە دواجاردا مەرگ بە دەستێکی پاراو و خاراومان دەکات، بە دەستێکی دیشی بۆ ناو عەدەمە نادیارەکانی خۆیمان ڕاپێچ دەکات. هەمووشمان لە بەرامبەر حوکمەکانیدا بەرابەر و یەکسانین! (هەموومان تەپوتۆزی ناو با ین –سارا برایتمان–)

*** حاڵەتێکی عیرفانی لە شیعرەکانتدا دەبینرێت، ئایا ئەمە پەیوەندی بە فیکرەوە هەیە یا فەنتازیا؟**

لای گۆتە لە کاتە ناسک و گرنگەکاندا هێزی ژیان بەهێزترە لە حەزی خۆتێهەڵقورتێنەری ڕۆشنبیرییانە. بۆ..؟ ئێریک فرۆم زۆر زیندووانە لەم ماجەرایەدا دەمانخاتە بەردەم بنەوانی سێ ئەزموون و سێ ڕوئیا و سێ دنیابینی ئیستاتیکی جیاواز؛ کە دەشێ بۆ ئەم بوارەی ئێمە کەڵکی هەبێت. ئەوەتا تینسۆنی شاعیری



ئینگلیزی ڕوودەکاتە سیحرگای گوڵ و دەکۆشێ لە چییەتییەکەی بپرسێتەوە: (ئەی گوڵە بچکۆلانەکە.. ئاخ، ئەگەر دەمتوانی تێبگەم؛ ڕەگەکانت، بوونت، بە تێکڕایی چین ئەوسا خوداوەند و مرۆڤم دەناسی). واتە تێگەیشتنێکی مەبەستگەرایانەی هزرمەندی.. لە تینسۆن دەخوازێ بۆ گەیشتن بە زانینی سروشتی خوداوەند و مرۆڤ تا سەرمەشقانە ڕۆبچێت بە ڕەگ و بوون و بۆنی گوڵدا، تا لە ناسینە بە کۆنکرێتانەی هزرەوە شوناسێکی ئەقڵانییانەی لێ هەڵبهێنجێ، ئەم پرۆسێسەش لە بەراییدا بە لەت و پەتبوونی جەستەی زیندەوەرەکان دەست پێ دەکات و، بە لێکەوتنەوەی لۆجیکی لابراتۆرییانەی ڕووەکناسی کۆتایی دێت! کە بۆ فەرهەنگی واقیعگەراکان ئەمەیە حەقیقەت چونکە سەد و هەشتا دەرەجە خۆی لە وەهم بەدوور دەگرێت!

(گەرچی واقیعییەت یەک وەهمە، هەڵبەت ناتوانین بێ ئەو بژین – نیچە–)

کەچی جنسی گوڵ لە جیهانبینییە سیپرچواڵیەکەی باشۆی یابانی بە جۆرێکی ترە.

(ئەگەر ڕوانیت، ڕوانینی ورد
نازو نای گەشەکردوو دەبینی، لە شورای ڕووەکەکاندا).

لێگەڕاوە ئازادی و ڕەهاکردنی ڕوانین، کەشفەکانی خۆی بکات. دەبێتە جێنشینی تێگەیشتنەکەی تینسۆن، تا شوناسێکی ڕۆحی و وجودییانەی لێ بکەوێتەوە.

چونکە باشۆ خوازیارە لەگەڵ گوڵەکەدا یەک بوونیان هەبێت و ببن بە یەک.

ئەم تەماهیبوونەش ئەستەم دەبێت واقیعییەتی پیرۆزی خۆی پەیدا بکات ئەگەر مینا تینسۆن تەنها هەڵوەدای موڵکایەتی مەعریفی بێت لە گوڵەکە و بەس!!

وەلێ باشۆ سەرسامی و خۆشییەکانی گەردوونی لا مەبەستە تا بە دەنگی مرخەمرخی موعجیزەکانیان سەرمەست و بە ئاشکرا بوونی دۆزینەوەی تەلیسمی گوڵ لە ڕێگەی (بینین و ڕامانەوە) دڵ خۆشبێت و هونەری فەنابوون لە نهێنییەکانی ژیان فێر ببێت و لەو دەنگەی کە لە ڕۆحی گوڵەکەوە دێت و دەکەوێتە قسە؛ ڕۆحی خەوتووی باشۆ بەخەبەر بهێنێ و بە وردیلە ئاوی ڕووی گوڵەکەش ڕووی دڵی گەردگرتووی بشواتەوە. باشۆ لەبەرئەوەی پێی وایە مادام گشت بوونەوەرەکان گیانی

خۆیان هەیە ناتوانێ بەسەر فەرمانڕەوایەتی دڵیدا زاڵ بێت (چونکە کەسێک بتوانێت بەسەر دڵیدا زاڵ بێت دەتوانێ دنیا داگیر بکات– پاوڵۆ کۆیلۆ)

نەک مەنفەعەتگەرایانە گشت هەوسارەکان بەدەستەوە بگرێت و مکوڕ بیخاتە بواری مەرج و نەخشەکێشانەکانی خۆی و مەسرەفکردنەکانەوە.

هۆسرڵ گوتەنی: (لێگەڕێین شتەکان بەو جۆرەی کە هەن خۆیان دەربخەن؛ نەک ئێمە چەمکەکانیان بەسەردا بسەپێنین) بە واتایەکی ڕوونتر ئێمە – دەرک– بە شتەکان ناکەین بەڵکو ئەوە شتەکانن خۆیان بۆ ئێمە دەردەخەن یا وادەکەن.. دەرکیان پێ بکەین. ئەمەش تەنیا لە ڕێگەی زمانەوە دەبێت. لەبەرئەوەی سروشتی بەدەروونیکردنی شتەکان یاخود بە ئەقڵانیکردنی شتەکان لە ڕێگەی زمانەوە دەبن. ئالێرەڕا مەسرەفکردنی شتەکان واتە بە مەسرەفبوونی زمانیش دەگرێتەوە؛ ئەمەش ڕاستە و ڕاست بە زیان گەیاندن بە جەوهەری زمان دەشکێتەوە!

شیعر لەو ساتە پیرۆزانەدایە زمانی خۆی دەکاتە ماڵی خۆی یا دروستر شیعر بێ زمانی خۆی نایەتە هەبوونایەتە شیعرییەکەیەوە. ساتی پیرۆزیش لە دەرەوەی شوێنکاتدایە بەپێچەوانەی کاتی فیزیکییەوە کە تینسۆن چالاکییەکانی خۆی تیا بە ئەزموون دەکات. کەچی دیدی باشۆش مینا هایدگەر ئاسا پێی وایە: (شیعر تەنیا دەربڕی خۆیەتی نەک شتێکی تر).

باشۆ بەم تەریقەتە شیعرییەوەیە دەکارێ ڕابگا حورمەت بۆ شتە مەسرەفکراوەکانیش بگێڕێتەوە. بەو مانایەی خاشاکی قیاساتی analogy زانستە کۆمەڵایەتی و سروشتییەکان لە زمانی شیعر ڕابماڵێ و بڕوامان پێ بهێنێ کە شیعر لە لووتکەی گوێڕایەڵبوون بە بەهاکانی خۆیدایە دەبێتە زێڕ؛ نەک لە ترۆپکی سەپێنراوانەی شتێکی تردا لە هێلانەی ئەزموونەکانی خۆیدا هێلکەی خۆی هەڵبێنێ نەک هێلکەی تێبینییەکانی شتێکی تر؛ بەو مانایەی لە بری ئەوەی ڕێگە بدا بە ڕەواییەتە بە بەرەکەتەکانی خۆی و کاربەدەستی خەونە ئاشکرابێژەکانی خۆی بێت، غولامی ڕەواییدان بە زیمەی توانایی ڕێگەکانی تر بووە. ترسناکی ئەم تێخوێندنەوەیەش لەوەدایە کە شیعر بە زمانی دلۆڤانییانەی خۆی لە پێگەیاندنەکانی خۆی نەدوێ و خۆی بەتاڵ بکاتەوە بە خاتری پڕ بوونی شتێکی تر! بە داخەوە لە –



ئەدەبی مانەوەدا– زمانی ئەندێشەو نادڵنیاییە ڕیسک کەرەکانی شیعر غەرز و لاقە دەکران و هەڵدەوەرێنران بۆ خاتری دڵنیایی ئایدۆلۆژیەتی شتە داسەپاو و داسەکناوەکان. هەوڵ دەدەم دواتر ڕۆشنایی بخەمە سەر سەرهەڵدانی نهێنییە ناڕوونەکانی ئەم میکانیزمە. لەبەرئەوەی بە قەولی ئادۆرنۆ .. لە بەرهەمی ئەدەبیدا وتەی کۆتایی نییە. با لە نێوان تینسۆن و باشۆدا گوێ بۆ گەشتە میانڕەوەکەی گۆتەش ڕابهێڵین: (لە ژێر سێبەرێکدا گوڵێکی بچکۆلانەم دی. وەک ئەستێرە، وەک چاوی جوان ئەدرەوشایەوە. وتم هەڵی دەکێشم؟

بە داماوییەوە وتی: ئازار بچێژم و لە ناو بچم؟ لە ڕەگەوە دەرمهێنا بردمەوە بۆ باخچەیەکی ناو خانوویەکی پاک و دڵگیر چاندم لەوێ لە جێگایەکی هێمندا. ئەوا ئێستا پێدەگات و بریقەی گەشانەوەی دێت)

بە داوای لێبووردنەوە! گەر شەریعەتی تینسۆن بە سادییەت ناو لێ بنێین و، باشۆ بە ماسۆشییەت ئەوا گۆتە سادماسۆشی پێ دەبڕێ!! (داوام ئەوەیە بە دڵ گەورەیی خۆیان بمبەخشن) لێ چی بکەم کە زمان تاکە بواری لێکدانەوە و تێگەیشتن بێ..؟

ئێمە لە نێو ئەم شێوازی بەرزەخانەدا دەتوانین چی بکەین؟ ئێمە گیر خواردووی ئەم دیلێمایەین و بە هەڵبژاردنمان بیروباوەڕ دادەتاشینەوە و، بە خۆ بواردنیش ونین!؟ داخۆ ئەدەب ونبوونی ئەو مەتەڵەیە کە بوێری بڕۆست ناوی لێنا بەهەشتی ڕاستەقینە بەهەشتی ونبووە!؟ تۆ ئیمان دەهێنی بەوەی ئەم هەقیقەتەش وەهمێکە لە پاڵ وەهمەکانی تردا؟!

یاخود شایەتمان بهێنین بە فەرمایشتەکانی مامۆستا حەمە فەریق حەسەنی چیرۆکنووس کە وازی لە کەشک لێدانی قوتابخانەی زێوەری کوڕان لە گەڕەکی گۆیژە نەهێناوە کە لە فێرکردنی مانۆێلی زمانی ئینگلیزی لێی دەداین و لاجانگی هەڵدەکێشاین هەر بۆ پێڕادەبواردن، هەنووکەش وەکو مامۆستایەک بەشێوازی دادپەروەرانەی خۆی کەشک دەوەشێنێت و کۆنەفرۆشی بە خەرج دەداو دەڵێت: (ڕەنگە بێکاری پاڵنەر و هۆیەکی کاریگەر بێ بۆ خودانە شیعر...) (ئایا لاوەکان زیاتر ڕوو لە زانست بکەن باشتر نییە؟) (ئەمڕۆ لە دنیای پێشکەوتوودا شیعر باری کەوتووە، چونکە مامەڵە لەگەڵ هەڵچوون و سۆزدا دەکا. بە باڵی خەیاڵ و هەندێ جار

بە واهیمە، لە زەوی واقیع دوور دەکەوێتەوە؛ وەڵامی پرسیارەکانی سەردەم ناداتەوە)
پێ دەچێ مامۆستای پێشکەوتنخوازمان کەشکی جاری جارانی توورِ هەڵدابێ و،
ئیدی نۆرەی وەعزدادان بێت و گەرەکی بێ فرِینی زانستییانە فێری باڵندەکانیش
بکات و، داوای پلاتفۆرمی بەرز بوونەوە و نیشتنەوەیان لێ بکات، چونکە باڵندەی
شیعر نابێ بۆ خۆی و لە خۆیەوە بجووڵێ، بەڵکو دەبێت لەسەر خواستی سێگۆشە و
پرگاڵەکانی ئەوانی دی بخوێنێ و هێلانە دروست بکات و دانەوێڵەش بخوات. دیارە
مامۆستا واقیعیش بە کۆبەند و یەکێتییەکی تێکرِژاو و کارلێکی رِەگەز و شێوازە
جیاوازەکان نابینێ.

ڤیکتۆر هۆگۆ دەرهەق بە ئازادی مناڵ رِای وایە نەخوازەڵا شاعیریش ئەوەی
پێویستی پێیەتی لە دەستی بستێنی و ئەوەی پێویستی پێی نییە بیدەیتێ ئیتر تۆ
خەسیوێکی لاتت هەیە. ئینجا مامۆستا لەسەر خەمخۆرییەکانی بۆ لات و
خەسیوەکان نایداتە باری زەحمەت و دەفەرمووێت (باوەرِم نییە لە پاریسدا، کە
دەکرێ بڵێین پایتەختی رِۆشنبیری جیهان، شاعیرێک هەبێ دووسەد گوێگر لە خۆی
کۆبکاتەوە، کەچی رِۆمانەکان بە هەزاران دانە چاپ دەکرێن و خەڵک بەردەوام رِۆمان
دەخوێننەوە! هەروەها بەردەوام دەچنە سەیری شانۆ و دیتنی فیلم، چونکە ئەم
هونەرانە زیاتر مامەڵە لەگەڵ هۆش و ئاوەزی مرۆڤدا دەکەن)

ناخوازم پنت بە پنت بچمە بۆرِبۆرِێن و هەرِاجخانەی (عرض و طلب)ە
سەپێنراوەکانی مامۆستاوە. وا دیاری دەدات ئەو لە سۆز و هەڵچوونەکانی
تێپەرِاندبێ، کەشک وەشاندنەکانی و گاڵتە کردنی بە شێتەکان شاهیدی ئەو
رِاستییەن، کە چۆرِێک سۆز و هەڵچوونی عیشق لە رِۆحی نووسەرێکدا نەمابێت
نازانم چۆن چۆنی دەنووسێ؟! کەچی رِۆماننووسێکی رِۆح جوانی وەکو پاولۆ کۆیلۆ
دەڵێت: ئەوە شێتەکان بوون عیشقیان دۆزییەوە. لە سەریشەوە ئاماژەم بەو گیانە
مەسرەفکارییە داوە کە مەرامی ئەقڵیانەی رِووت، دەشێ وجودو جەستەی شتەکان
هەلاهەلا بکات بۆ خاتری موڵکایەتی مەعریفی کە ئێریک فرۆم وەهای ناولێنا.

ئەنشتاینیش وەک زانایەک و زانست پەروەرێک دەرکی بەوە کردووە: کە فەنتازیا
گەلێک پێویستترە لە زانست بۆ دەروونی مرۆڤ. یاخود سۆمەرست مۆمی
رِۆماننووسیش بە تەوازوعەوە دەڵێت: ئەو هونەرەی شاعیر بەکاری دەبات، لەو



هونەرە بەرزتر و جوانترە کە کەرەستەی کاری رِۆماننووسە. پوختە.. ئەم نموونانە بۆ
ئەوە نین جێگەی هیچ ژانرێکی ئەدەبی بە کەم بگیرێت لەسەر حیسابی ژانرێکی تر
وەک میتۆدە گیان تۆتالیتێرییەکەی مامۆستا کردوێتی. بەڵکو تەنها بۆ نیشاندانی
تایبەتمەندی هەریەک لەو ژانرانەیە کە تەنێ خۆیان بە دەستی سیفەتەکانی خۆیان
هەڵدەچنن و، شیعریش لە دواجاردا بە زمانی تایبەتییانەی خۆی و شتێکی تر نا،
مەعریفەی خۆی بەرهەم دەهێنێ لە پاڵ زمانی مەعریفەکانی تردا، کە دەتوانین بە
مەعریفەی شیعری ناوی ببەین، کە بیرکردنەوەی ئەدەبییە. نەک دابەشکردنی
فەرمانبەرێتی و هەژمونگەری بەسەر گشت ژانرەکاندا، وەک مامۆستا حەمەفەریق بە
زەبری کەشک وەشاندن ئاشبەتاڵ و کاولاشی شیعری پێ رِاگەیاندووین. چونکە
بەپێی ئارگومێنتە زانستی و ئەقڵانییە تەنزئامێزەکەی مامۆستا (شیعر هی
شێتەکانن) لەوە دەچێت ئارگومێنتەکانی مامۆستا ئەوەی تیا نەبێت کە هەموو
داهێنانێک جۆرێکە لە ئیشکردن لە نامەئلوفیەتدا.. شێتەکانیش خەڵکە رِەفتار
نامەئلوفەکانی نێو کۆمەڵگەن ئەمەش دەکاتە ئەوەی بلیمەتەکان خزمی هەرە نزیکی
شێتەکان بن!! نیچەش ئاوها نوقڵانەی مرۆڤی باڵا لێداوە: (ئەو کڵپە ئاگرە لە کوێیە،
تا پاکتان بکاتەوە. ئەو شێتایەتییە لە کوێیە، کە دەبێت دەست بە سەرتاندا بگرێت؟
ئەوە ئێستا باسی مرۆڤی باڵاتان بۆ دەکەم، مرۆڤی باڵا جگە لەو کڵپە و شێتایەتییە،
هیچی دیکە نییە). هاشم ساڵحیش پێی وایە تاڵە موویەکی باریک بلیمەتی لە شێتی
جیادەکاتەوە هەروەها لودفیک فتگشتاین وەهای بۆ دەچێت: وەک چۆن نەخۆشی لە
هەموو لایەکەوە تەندروستی دەتەنێ، شێتیش لە هەموو لایەکەوە ئەقڵ دادەگرێ.

ئەندرێ مۆرۆی نووسەری فەرەنسیش لێیان پرسی ئایا هەموو رِۆماننووسان شێتن
یان کەسانی عوسابین، نیرۆسین Neurosis؟ لە وەڵامداگوتی: نا، رِاستتر وایە بڵێین
ئەگەر نەبوونایە بە رِۆماننووس ئەوا دەبوونە کەسی نێرۆسی. نێرۆسیس هونەرمەند
دروست دەکات و هونەریش لەو نەخۆشییەی چاک دەکاتەوە.

مەزنە فەیلەسوفێکی وەکو شۆپنهاوەریش کە نیچە و ڤاگنەر بە توندی لە ژێر
شەپۆلەکانی فیکری ویدا بوون، لە تەمەنی ٢٦ ساڵیدا بوو خۆی بە مەسیح بەراورد
دەکرد و لەو برِوایەدا بوو نێردراوە بۆ ئەوەی رِێگەی حەقیقەت پیشانی خەڵکی بدات!
ئەم قەشمەر جارییانەی مامۆستا حەمە فەریقی ئەهلی زانستی کەشک وەشاندن و

فەلسەفەی مووی لاجانگ دەرکێشان، کە بە شێتەکانی دەکات ئەم چەواشەکارییە لە قووڵایی خۆیدا دیارە بە مانا کاریکاتۆرییەکەی مامۆستا چیرۆکنووسەکەی لەمەڕ ئێمە نا، بەڵکو هەژمونگەراییەکانی ئەقڵ بەسەر هەموو شتێکەوە میشیل فۆکۆی هێنایە سەر ئەو باوەڕەی دروستبوونی زیندان و شێتخانەکانی دنیای مۆدێرنە دەگەڕێتەوە سەر کۆجیتۆکەی دیکارت: من بیر دەکەمەوە کەوابێ من هەم لەبەرئەوەی شێت بیر ناکاتەوە لە میتۆدە ئەقلانییەکەی دیکارتدا کەواتە نییە، کە لە پراکتیکدا دەکاتە سڕینەوەی شێتەکان لە واقیعدا! ئەمەش بەهانەی هەڵچنینی شورەی شێتخانەکانی خۆش کرد لە دامودەزگا و ئەقڵی مۆدێرنەدا. جا بەپێی پێودانگەکانی مامۆستا شاعیران بە باڵی خەیاڵ و هەندێ جار بە واهیمە لە زەوی واقیع دوور دەکەونەوە، لەبەرئەوەی هۆش و ئاوەز بەکار نابەن بۆیە لە کۆڕەکانیاندا دووسەد گوێگر لە خۆی کۆناکاتەوە. چەند بێ پێزو هەژارە ئەم پێوانە چەندایەتییە. بەڵکو مامۆستا لە نووسینەکانی تردا، پێشنیاری شوورەش بکات بەدەوری شاعیراندا (خوا عەفوت بکات مامۆستا, نە خانی خانان.. نە تۆزی بانان)

***

دەشێ سروتی شیعریی بێ.. بکارێ؛ فەنتازیا لە ئێمەدا بێدار بکاتەوە! چون پیاسە کردنەکەی گۆتە (بە تەنیایی، لەگەڵ خۆمدا بە دارستانێکدا ڕۆیشتم، هیچ بە مێشکمدا نەدەهات، تا بە شوێنیدا بگەڕێم، لە ژێر سێبەرێکدا گوڵێکی بچکۆلانەم دی، وەک ئەستێرە، وەک چاوی جوان ئەدرەوشایەوە....) ئەم سروتە نزیکە بە دنیای باشۆ وەکو خەیاڵ؛ هۆشی گۆتەش دیوەکەی دیکەیەتی لە چوارچێوەی شێوازی بوونایەتیدا نەک ڕوانینی تینسۆن کە تەنێ هەڵوەدای زانینی بۆن و ڕەگ و بوونی گوڵەکەیە، تا لەوێوە دەستی بە مرۆڤ و خوداوەندیش ڕابگات وەکو بیرکردنەوەیەکی ئامانج زانستییانە.

لای تینسۆن وزەیەکی خەفەبووی ئەقڵی کە مەعریفەی لێ هەڵدەقووڵێ (لە دواجاردا شتەکان ئۆرگانیزە کراو و جێگیر دەکات) لای گۆتە و زۆرتر لای باشۆ وزەیەکی خەفەبووی ڕۆحی کە جوانی گیانی سروشتی لێ هەڵدەقووڵێ بەرەو کرانەوەیەک ڕێ دەکات کە خوێن لە خەیاڵ و ڕوانینە ویژدانییەکانەوە مسۆگەر دەکات بۆ هەڵهاتن لە وەحشەتەکان! تینسۆن لە ڕێگەی شکاندنی دەرگاکانی



جەستەوە، پەڕەی گوڵ و بوون و ڕەگەوە بۆ گەیشتن بە چییەتی ڕووەک و مرۆڤ و خوداوەند هەوڵ دەدا کە لە دووجاردا بە شت بوونیان دەگات. لای باشۆ خۆدانە دەست چێژ و خرۆشان و ئاسوودەییە دەروونییەکانە! تینسۆن مەرجەکانی دەرەوە دەسەپێنی بەسەر ناوەوەی گوڵەکەدا!

لێ باشۆ خۆی و ڕوئیاکانی داوەتە دەست ئەو جووڵە ناچۆڕاڵییەی ناوەوەی گوڵەکە بۆ دەرەوەی خۆی. خولاسە تینسۆن لە ئەزموونی خۆیدا ئەو مانایانەی دەیگوێزێتەوە، باشۆ لە ئەزموونە شیعرییەکەیدا ئەو مانایانە هەڵدەوەشێنێتەوە! لەو بۆشاییانەدا کە بەجێماوە گۆتە ئاورنگی بەردەچەرخی تافە تافی ڕووناکییەکی ترە لە نێوان مەعریفەی ئەقڵی تینسۆن و مەعریفەی دڵی باشۆدا پریشکی لێدەبێتەوە.

لەبەرئەوەی عاریف دڕدۆنگە لە بەرامبەر ڕۆڵی هەڵخەڵەتێنەرانەی هەستەکان کە ناتوانن بیگەێننە هەقی یەقین، - باوەڕی ڕاستەقینە- . ناچار بە جۆرێکی تر پراکتیکی ویستی وجودییانەی خۆی دەکات. ئیدی هەوڵ دەدا چاو و لووت و گوێ و زمان و لەمسی عاریف بە جۆرێکی تر پەیوەست بن لەگەڵ دەرەوەدا، ئەمەش ڕوونادات تا دەرەوە بە پرۆسەی دەروونیبووندا نەگوزەرێنێ ئەمەش لە ڕێگەی خەیاڵ و تەئەمولاتێکەوە کە خاشاکەکانی لێ دەماڵن و پاکی دەکەنەوە... تا دەگاتە ئەوەی فاسیلەیەک لە نێوان دەرەوە و ناوەوەدا نامێنێ. ئیدی لەو سروتەدایە پێستیش ڕۆحە -نیچە - .

هەموو شتەکان لە موعجیزە زیاتر شتێکی تر نین و بەمەش بە قەولی فرۆم لەگەڵ گەردووندا یەک دەگرێت. و لەگەڵ گشت شتێکدا کۆک و تەبا دەبێ! هەر بۆیە لە بەراییدا زاهید بۆ گەیشتن بەو شێوازی بوونایەتییە، دەبێ واز لە خاوەندارێتی بهێنێ تا لە خۆپەرستی دوور بکەوێتەوە و، بە چاوی مەسرەفکاری و مەنفەعەتگەرایانە نەڕوانێتە دەوروبەری. کەچی زۆربەی خەڵکی وا دەزانن بە دەستبەرداربوون لە دەستکەوتە مادییەکان ژیان یەکسان دەبێت بە دڵەڕاوکێ و نیگەرانی، لێ زاهیدان پێیان وایە مولکدارێتی ئاسوودەیی ڕاستەقینەیان لێ بزر دەکا، چونکە مولکدارێتی ڕۆح پیس دەکات، گەراکانی چاوچنۆکی دەترووکێنێ.. تۆڵە سەندنەوە دەکاتە خوو.. مل شکاندنی یەکتر دەکاتە جۆرێک لە ڕۆتین، کە ئەمەش

رووی دا تەلیسم و ڕۆحی ڕاستەقینەی شتەکان بەشیاوی و ڕووتی نابینی یا ناتوانی هاوسەنگییەکانت بە خەبەری بهێنی لە نێو تەڵەزگەکانی وەحشەتدا. ئەمەش ئەو باوەڕە ڕاستەقینەیەیە کە لە مەرجە دنیاییە زوو تێپەڕەکانیان ڕزگار دەکات و، جارێکی دی لە دەرەوەی مەرزە مادییەکانەوە وجودی تازەی خۆیان دەخوڵقێننەوە. ئەم باوەڕە ڕاستەقینەش بۆ ئەوان ڕزگاربوونە ڕاستەقینەکەیە! ئەم مەیلەش بەقووڵی لە مەحوی گوڵی کابەی سۆفیگەرییانەی کوردیماندا ڕەگاژۆ بوو.

«حاڵە بەدحاڵی لە شوێن و ماڵوێرانی لە دوو
(مەحویا) گەر ئەهلی حاڵی ماڵ و حاڵم بۆ چییە.
دنیا تیاترۆیە، مەوەستە تیا بڕۆ
کێ مایەوە تیا، کە نەبووبێ تیا، تڕۆ».

لە ئاستێکی تریشدا یۆگاییەکان پێیان وایە سێ جۆر جەستە هەیە : جەستەی چڕی مادیی کە وابەستەیە بە هەستەکانەوە و، لە ژێر چالاکییەکانی ئەودایە.

وە جەستەی کەوکەبی هەیە کە لە خەوندا دەردەکەوێت، کە جەستەیەکی هەڵمییە و لە دوای مەرگیش لەناو ناچێت. سێیەم جەستەی سەبەبییە کە کاملترین و بڵندترینیانە، وەرزشی یۆگا تەریقەتێکە هەوڵ دەدا بۆ گەیشتن پێی.

لە تەسەوفیشدا سێ قۆناغ هەیە بە عیلمی یەقین و عەینی یەقین و هەقی یەقین ناو دەبرێن.

ئەو نموونانەی سەرەوە بۆمان ڕوون دەکەنەوە کە دنیای شاعیران و عاریفان بە گەشتکردن بە نێو نادیارەکان و هێنانەگۆی شتە لاڵەکان و گێڕانەوەی بەهاکان بۆیان هاوڕێی یەکدین. پرەنسیپی عارف بە تەریقەتەکانییەوەیەتی. وەلێ پرەنسیپی شاعیر هەڕەمەکیەتی زمان و فەنتازیایەکە کە بە تێکرژان و لێکخشان و پیتاندن و کارلێکی هێندە ئاڵۆزدا دەگوزەرێ کە لەڕێگەی تێکستەوە بەهەڵکشانە مەعریفییەکانی خەیاڵاتی خۆی دەگات. دواتر لە ڕووبەرە ماسکدار و بێ ماسکەکانی تێکستەوە هەوڵ دەدرێ ڕوون بێتەوە و تێبگەین ڕایەڵی بەڕێوەبردنی ئەو گەمانەی دیار و نادیار چی بوون و ڕۆڵی ڕەگەزە جیاوازەکان بەشێوەکارییەکانی چ مەعریفەیەک و.. بە ئیحاکانی چ سیحرێک و.. بە پەیژەکانی چ ڕەمز و.. هێما گەلێک



و.. بەمیلۆدراماکانی چ باگراوندێک و.. بە نیگەرانییەکانی چ هەڵوەدابوونیک و.. بە زەمزەمەکانی چ جوانییەک و.. بە یۆتۆپیاکانی چ تەلیسمێک و.. بە وێڵبوونەکانی چ شەیداییەکەوە سەرگەردان بووین و.. بە چ وەهمێکی وێناکراو گیرساوینەتەوە و.. ئەم وێڵگە مێژوویی و نامێژووییانە بە گوتراوەکانی چ زمانێکی ئەفسووناوی تەمەن کورت و درێژ دەچنەوە سەر موولوولە و شادەماری ئاگایی و نائاگاییە ناسراو و نەناسراوەکانمان، کە ئەمەش ئۆباڵی خوێنەر و ڕەخنەگریش دەگرێتەوە!؟

*** شیعر هەوڵدانێکی بەردەوامە بۆ بەرهەمهێنانی مانای نوێ ئایا لە شیعری نوێی کوردیدا ئەم هەوڵە تا چەند بە ئاکام گەیشتووە؟**

وای بۆ دەچم شیعری نوێی کوردی یەکەندەرو بەوە ناس ناکرێ لە بەرهەمهێنانی مانای نوێدابێ، بەڵکو لە بێ ماناییەکانیدا چینە دەکا و ناوی شتەکانی بۆ خۆی لێ نانرێ. چونکە بە ناچاری هێندەی خەریکی یاخیبوونێکە لە دەست ئەو پاوانخوازییانەی بە هۆی هەر زەرووڕەتێکەوە بووبێت بوون بە داینەسۆر و بە مێگەلیەتی چێژێک و.. تەئویلێک و.. وەهمێک و.. پەتایەک کە لە لاشعوری دەستە جەمعیماندایە پاڵنەرە چاوچنۆکەکانی خۆی دەدۆزێتەوە و درێژەی بە جوانییە سواو و بێ ڕۆحەکانی خۆی داوە. زەمانەتی ئەم تەرزە ستایلە کۆلێکتڤیەش کۆگەل- بە درشتە ڕوانین ناودەبەم کە مشەخۆرە بەسەر ڕۆشنبیرییەکەی خۆشیەوە.

توانای نوێبوونەوە و تێپەڕاندنی ئەفسانەکانی خۆی نییە، لەبەرئەوەی گومڕاییەکەی نائاگایە بەو میکانیزمانەی لەو تەنگژەیە وەدەری دەنێن. حەز دەکات لە دایک ببێتەوە، وەلێ نایەوێ هیچ شتێکی لێ بمرێت، بگرە جورئەتی بینینی مردنە میتافۆرییەکانی خۆیشی نییە! دەشێ درزێکی ڕۆشنبیرانەی فرە ئاراستە بکرێتە ئەو دیوارەی کە ڕێگرە لەبەردەم زیندووکردنەوەی بینینە ئیستاتیکییەکاندا.

ئەمەش تەنها و تەنها بە جێهێشتنی درشتە ڕوانین و جێنشینبوونی وردیلە ڕوانینەکان دەبێت. کە دەکاتە وادەهاتنی مەرگی داینەسۆرەکان لەبەردەم گیانلەبەرە وردیلەکانی ڕۆشنبیرییدا. ئیدی مێژووە قەبەکان لەوە زیاتر پف نەدرێن و بە وردە تێکستەکان جێ بە درشتە تێکستەکان لێژ بکرێ و بوترێ و بسەلمێنرێ، چیدی مەزنی لە گەردن کلۆفتی داینەسۆرەکاندا نییە و لێرە بەدوا کێو ئاوس بێ مشکی لێ

دەبێت! ئەمەش هەڵکێشانی شمشێر نییە هێندەی هەڵبوونەوە و بووژانەوەی ئەو تێکستانەن ئیدی گەرەکیان نییە بڵندگۆ و زایەڵەی حەسارێک بن کە پێش هەر شتێک دەنگ و ڕەنگ و بۆی ئەوانی تیا خنکێنراو و خەسێنراوە. ئیدی نا بۆ شاوتارێک کە دەچێتەوە سەر هەموو ئەقڵ و دید و ئینتما و پرۆژە جوداکان. نا بۆ شاشەقامێک کە دەچێتەوە سەر هەموو دەرگاکان. بەڵکە هەر ڕێگە بۆ بەردەم ماڵی خۆی.. هەر کلیلێکیش بۆ کردنەوەی دەرگای خۆی. ئیتر بە ڕێکەوتنی ئەو ڕێبوارە تەنیا و خۆ پاکژکردوانەیە چۆن چۆنی لە ناو چ پرۆژە و لە ژێر لوتفی چ ئاسمانێکدا گرد دەبنەوە. واتە هاتنەدەر لە خۆ تواندنەوە و خۆ لە دەستدان و سڕینەوەی تایبەتمەندی و خۆ حەشاردان لە تاکدەنگی ناوەندێکدا، کە تۆی کردۆتە کەناری خۆی. نا بۆ پارادایمە (نموذج) ئاینییەکانی کۆلێکتیڤیەت و خۆ ڕاپسکان و خۆ ئاشکرا کردن لە نێو فرە دەنگی ئیندیڤیدواڵیەتێکدا، کە تێکستەکانن لە نێو یەکدیدا دەرسکێن و درێژ دەبنەوە و مانا دەخەنەوە و دیالۆگ دادەمەزرێنن.

بۆ وێنە وەرزی خەمە وجودییەکەی عوسمان شەیدا لە پێش ساڵی هەشتادا لە قەسیدەی- خەزاندا-

«.... زەمەن خەمی من هەڵناگرێ/
بەتەنیا خۆم دەخۆمەوە/
زەمەن پیرە درەختێکی پاییزەیە/
منیش گەڵای زەردی خەمم/
تەنیایی بڕستم دەبڕێ؛هەڵدەوەرێم/
درەخت دەست ناداتە باڵم../
زەوی لە ئامێزم ناگرێ/
لە نێوان زەوی و درەختا/
تەنیایی دەمداتە دەست با...٩٧٩ , »

وە دواتریش – لەغوربەتا ی موحەممەد عومەر عوسمانی لە دەسپێکی هەشتاکاندا بەدوادا هات؛ و هەنووکەش ئەو خۆ درێژ کردنەوە بە بەرەکەتانە وردە سروتگەلێکی



خۆی هەیە، دژی خۆ گرمۆڵە کردن لە مشتی درشتە پەیامەکانی کۆلێکتیڤیەتدا، بە شێوەی جیاجیا و بە تەنیایی ئەزموونی ڕوئیا و تەفسیر و خەونبینینە ڕەنگاوڕەنگەکانیان دەکەن و هەر بە دەستی ئەو ئەزموونانەش وێنای خۆیان دەکەنەوە.

ئیدی لێرەوەڕا ئەوە سەنتەری دەنگی مێژوو و دەنگی نەتەوە و ئاین و ڕیالیزمەکان نین وێنای تۆ دەکەن و ملکەچ و پەلکێشت دەکەن بۆ نێو سەنتەر و نەخشەکانی چەندەها ئەرکی ئایدۆلۆژی و ئەخلاقی و دینی و حیزبی.. و.. تاد بەڵکو ئەوە وردە سەنتەری خۆت و دەنگی وردە مێژووی توانا و ویستەکانی خۆتە بڕیار دەدەن لە وێنا کردنت و تەنێ نانی تواناکانی خۆت دەخۆیت. نەک بەرات و ستایش و شاباشی سەنتەرێکی ڕۆح گزگل. بەڵێ ئەم وێنایەی خۆت لە پاڵ چەندین وردە وێنای تردا کارلێک دەکەنەوە و، یەکتر دەبڕن بە مانا ئیبداعییەکەی. بە شێوەی ئایۆنینی ئەگەری وێنای ترمان بۆ دەزێنن. نەک مینا کۆلێکتیڤەکان هەموو مێگەل ئاسا خول بخۆین بە دەوری کەعبەیەکدا کە یەک لۆجیک و یەک ڕەنگ و یەک دەنگە.

خولاسە ئەم تەوژمگەلە فرە ڕیتم و فرە ئاراستەیە، تەنها بە جێگۆڕکێی ئەو دوو چەمکە کۆلێکتیڤی و ئیندیڤیدواڵیە نییە بە مانا دوالیزمیەکەی، بەڵکو هەرەس پێهێنانی تارمایی و کولتووری ئیستاتیکییانەی حەسارێکە کە هەموو سەرخان و ژێرخان و ڕێگە و بانەکان جگە لە گوزارشتکردن و کڕنوش بۆ هەیمەنەتی حەسارەکە شتێکی تر نەبوون. ئەم ڕۆشنگەرییە شیعرییە بۆ ئەوەی خۆی بێت، دەبێ خۆی سەنتەر و پەراوێزی تایبەتمەندیی بەهاکانی خۆی بێت. چۆن شیعر لە یەکەمین شوناسیدا لە زمانی فەرهەنگی گشتی یاخی بوو و جیابووەوە، (کلام) و (لغە) سنوور و ئامرازەکانیان لێک دابڕان و ئەو هەنگاوەش هەروا سانا نەبوو. ئەوا بە هەمان تەوژم و ڕاتەکان و قووڵی بەهێزتر لە ماکی (ئەدەبی مانەوە – کۆلێکتیڤیەت–) بێتە دەرەوە و جێی بهێڵێ بۆ مێژووی سەروەرییەکانی خۆی و پێیان بێژێت: سوپاس بۆ جوانی و سیحرێک پێتان بەخشین مەخابن چیدی ئەو وێنە و جیهان بینییانە جۆش و خرۆشمان تیا هەڵناقوڵێنن و سەرسامان ناکەن. ڕاستە ئێمە لە ئێوەوە زمانمان گرت وەلێ بۆمان ڕۆشن بوو چیتر ئەمە زمانی ڕاستەقینەی ئێمە نییە،

بەڵکە زمانی ئێوە بووە لە دەممانداا! ئەگەر ڕاچڵەکینی ئاوها نەبێت هەر فۆتۆکۆپی خۆمان دەکەینەوە و.. ئەوانیش دەستبەرداری وەهمە بنکۆڵبووەکانی مامۆستایەتەکانیان نابن و پەتاکانی ئەوانیش بۆ خۆمان دەگوێزینەوە. چۆن (بەهای بەها).. (ڕەخنەی ڕەخنە).. (بەرزەخی بەرزەخ) (خوێندنەوەی خوێندنەوە).. (عەدەمیەتی عەدەمیەت) هەن؛ دەبێ ئەم نوێبوونەوانەش بۆ یاخیبوون و واوەترچوون و تێپەڕاندنی فەرهەنگی شیعری (ئەدەبی مانەوە) بێت.. کە دەتوانرێ بە (شیعرییەتی شیعر) ناوی ببرێ.

لەبری ئەوەی بە شاعیری نەتەوە و قاڵبی ڕیالیزمەکان و کۆمەڵێ تەوتەمی تر قاڵ بکرێن و ساغ بکرێنەوە... شاعیری دنیا بچووکەکانی خۆیانن و وشە و ڕەمز و هێما و چەمک و دەلالەت و زمان و چێژ لە تێکستە بالاکانەوە دێن و دیسانەوە دەچنەوە دەست سەرکێشی و ڕیتمی تێکستەکان خۆیان و بەرەو ئۆڵمپی مانا جیاوازەکان ڕێ دەردەبەن. هەنووکە دەشێ ئینديڤيدواڵیەتی ئەدەبی بۆ خۆبەڕێکردن بە توێشووە ڕۆشنبیرییەکانییەوە لە دایک ببێ و لە تراژیدیا و کۆمیدیاکانی خۆی بدوێ و بگێڕێتەوە. نەک دیسان و دیسانەوە لەلایەن پاڵەوانی نەتەوەییەوە بیریان بۆ بکرێتەوە و نۆرم و سنووری ئازادیی و وەسوەسەکانی بەناوی بەرژەوەندییە گشتییەکانەوە لە پرسی ئەدەبی مانەوەدا یاخود دروستر- ئەدەبی تەوحیدا – قەتیس و تیرۆر و ئەتک بکرێن. لێگەڕێین مرۆڤ و خەونەکانیان بەو جۆرەی کە هەن خۆیان دەر بخەن و بدوێن) چونکە دووان سروشتی ئێمەیە و توانای پەیڤینمان هەبێت. (پەیڤین وا لە مرۆڤ دەکات مرۆڤ بێت – هایدگەر-) با زمانی برین و بەختیاری و تەنگانەکان لە واعیز و ئایدۆلۆژییەتەکان بسێنینەوە و ببەینەوە ناو دەم و زمانی پڕاوی وشەکانی خۆمان و باوک و فرزەندی ماهیەت و ویستەکانی خۆمان بین. ئەمەش بە گۆڕین و لابردنی مەسخکردنەکانی تاک زمانی دەبێ بۆ فرە زمانییەکی پوختتر و بەرزتر. دەسپێکێکیشە بۆ مانای نوێ و هەڵوەشاندنەوەکانیشیان.. بۆ ئەم سەفەرەش پێم وایە هێشتا لە گاگۆڵکێداین بۆ ئەو شتەی دەبێ ببین!

*** ئەنوەر چۆن گوزارشت لە لەحزەی نووسین و بەرهەمهێنانی دەق دەکات؟**

لە بێشەی ئەندێشەکانمدا خۆم ون دەکەم و لە دووی هالاوی شوێنپێکانی حەکایەت و



داستانەکانی ئەو بزربوونانەم دەگەڕێم. بۆ ئەوەی تووشی پاکوتێش (تراوح) نەبم، ئەمە هێزێکی وەهام دەخاتە بەر کە وەک شاباڵدارێکی شێت باکم لە کردنەوەی سندوقی پاندۆراش نەبێت کە پڕ پڕە لە شەڕی کلۆمدراو!

جار هەبووە ئازادیی خەیاڵێکمم ڕەت کردۆتەوە کە دەرکم کردووە لە پێچێکیدا دەمکاتە نێچیری ئەقڵییەتێک کە لە بیرێکی سەرداخراو دەچێت، نە هیچی دەچێتە سەر نە هیچی لێ دەچێتە دەر!

دەزانم بێ ویستی خۆم زۆر سادییانە جەرگی وشە و گوزارشتەکانم هەڵکۆڵیوە و هەڵدەکۆڵم، بەڵام ئامادەم ببمە غولامێکی ڕامکراو و کۆیلەیەکی ئەڵقە لەگوێی ماسۆشی خەیاڵێکی جوانی ئەو وشە ڕۆح سەربەست و سیحرئامێزو تازە پێگەیشتووانەی کە ئاغرانە خۆیان نمایش دەکەن و ئەو سەرمەشقەیان لێ دێت.

لە دەسەڵاتی ئەو وەهمە بێ شوناسانەش ناپرینگێمەوە کە لە بەرزەخی نێوان ورد بوون و بڵندبوونێکدا ڕامدەگرن و لە سەرچاوە و شوناسی شەڕەنگێزیی خەیاڵئامێزییەکانم دەکەونە شکەوە!

بەڵێ بێوەفایانە ئامادەم فیکرێکی سیستماتیزەکراوی بنچکداری کۆنە ئاشناشم بدۆڕێنم، بە جادووی پەیڤێکی بە ئاین و ئۆینی نائاشنا کە بڕواکانم ژێروژوور دەکا و غەرقی ئۆرگازمی لەزەتێکی ساتەوەختانەی نەشئەبەخشی تازەگیانم دەکا.. کە بۆ ڕۆحم تازە و شیفابەخشە.

هێندە سوننەتی و تەقلیدییم لە بەردەم ئەزموونێکی تازەزاوی غەریزەییانەی خەیاڵێکی خوێن شیرینی بێ غەل و غەشدا دەچمە سەر بەرماڵی بیرکردنەوە و دۆعای تەمەن درێژی لە خوای جوانی بۆ دەکەم، کە لەدەستی ناگەهانی کارەساتەکان بیپارێزێ.

تێکستەکان هەناسە بە هەناسە تەنها شاهیدێکی دەم و دەستپاکی ئەو چەشە و حاڵەتە سرکانەن و تەمەننا دەکەم بوختان بە دەمیانەوە نەکەم. خۆشت گەر دەخوازی و ئارەزوو دەکەی، بێ من بیاندوێنی... فەرموو ئازادانە نەهۆم و ژێر پێست و باخچەی تێکستەکان بپشکنە، تا گەیشتن بە گوڵکردنی مانا و چێژ و ڕوانینێکی تر.

* لە نێو شەپۆلی زۆری و بۆری بڵاوکردنەوەدا چۆن بتوانین دەقی نەمر بدۆزینەوە؟

– دەبێ چاوی گورگمان هەبێت، لە زەوی ڕەشدا مووی ڕەش ببینین. ئەزموونەکانمان بە جەنگەڵ و زەنوێر و پێدەشتەکانی دەقدا پەرت بکەین و گوێبیستی ترپەی هەموو جووڵەیەک و بۆنێک و ڕۆشناییەکی غەریب بین. لەو ڕووبەڕووبوونەوە کتوپڕ و بە حەوسەڵانەشدا هەتا هونەری هەڵمەت و خۆ ماتدانمان لە ئەوجدا بێت کەممان گوتووە.. ئاخر هیچ شتێک سانا خۆی پێشکەشی هۆشیاریی و چێژەکانی ئێمە ناکات ئەگەر جۆرێک لە سەما نەزانین لە گۆڤەندەکانی ڕامکردن و ئولفەتگرتندا .

دەبێ هێرشی ڕاستەقینەی خۆمان لە کات و ساتی کورت و درێژخایەنەکاندا ناز بکەین. ئەمەیە چێژی نێچیر لە ئێمەی دەخوازێ! نەک تەنزیلات....

گۆڤاری هەنار – نۆڤەمبەری٢٠٠٦

# ئێمە گوێ لە گەشتەکانی یەکتر دەگرین

سازدانی: مەریوان عەلی

*– پێت وانییە شیعر ئەو دەرگا داخراوەیە، کە هەمیشە مانەوەی خۆی لەو داخراوییەدا پاراستووە، لای ئێوە پرسیار لەو داخرانە لە کوێدایە؟*

+ لەو سروشتە سەرابییەی شیعردایە، کە پێیەکی لە بوون و پێیەکەی دی لە نەبووندایە.

*– واتە– پێی دەگەیت و ناگەیت! نیگات کردووە، وەلێ شوناسێکیشت بۆی نییە. هەروەک ئەو ڕۆحە فرە ڕووەی لە ستراکتۆری – هەبوونی– ئێمەدا هەمەکارەیە و، کەچی ناتوانین (ناوێکی ڕاستەقینەی لێ بنێین).*

کۆششکردن بۆ ئەو ناولێنانە و ڕام نەبوونی، وێ دەچێ ئەو دەرگا داخراوە بێت. کە هەر دەڵێیت: بێدەر و دەروازەیە! کەچی لە دەستیشی دێت لە هەموو هەوارێکیشدا حزووری ڕاستەقینەی خۆی هەبێت.

بەڵێ بەشێک لە مانەوەی شیعر لەو خەسڵەتە یەزدانییەدایە کە پڕە لە ئەفسانەسازییەکانی باوەڕکردن و باوەڕ نەکردن و گومانیش! ئەوە تۆی موسافیریت، چۆن مەزەندەی ئەو دەرگایانە و ئەودیو دەرگاکان دەکەیت. تەنها شاهیدێکیش ئەو هەقایەتانەن کە لە توێی (تێکست)ەکەوە گەشتەکەمان بۆ دەگێڕنەوە.

دە ساوایە با گوێ لە گەشتەکانی یەکتری بگرین.

– کەواتە (وا بزانم بووم بە..وشە) لە کوێی ئەو بوون و نەبوونەدایە؟ ئایا بۆ دەڵێین وڕێنەیە و ئەو ناوە لە کوێوە هاتووە؟

+ کێشەکە لەو گرێبەندە دایە کە کردنەوەی جۆرێکە لە مەحاڵ. ئەم ڕیسکە دەروونی



و وجودی و فیکرییانەیە کە (وشە) گرتوێتییە ئەستۆی خۆی و چووەتە نێو (جابوڵقا) کانی ئەو مەحاڵەوە!

وشە بەدەم نزاکانییەوە گەمە ڕۆحییەکانی خۆی دەست پێ دەکا و لە زمانی نیکۆس کازانتزاکییەوە دەڵێت:

خودایا کەوانێکم لە نێو دەستدا ڕامنەکێشی دەڕزێم! خودایا لە ڕاکێشانا ئاگات لێم بێ نەپچڕێم! خودایا دە زۆر زۆر ڕامکێشە هەتا دەپچڕێم!

بە ڕاست ئەم نزایانە ڕاستگۆ و ڕازگۆن لە هەمبەر ئەو وڕێنە و وەهمانەی دەمانهێننە سەر ئەو کەڵکەڵەیەی کە (هەقیقەت)ی ئەودیو دەرگاکانمان کەشف کردوە و لە – نەبوونەوە – هێناومانەتە– بوون– ؟

– لە نێوان سەمای وشە و ڕوانین و عەقڵدا، دەتوانین بە کەسی شاعیر بڵێین تێکستێکی تەواو؟

+ نا.. لەبەرئەوەی لە دواجاردا شاعیر بۆ خۆی فۆرمێکی یا ڕوویەکی تێکستەکەیە کە جێگا دەهێڵێتەوە بۆ هۆشیاری خوێنەر و ڕەخنەگریش. ئەمەش بەپێچەوانەی ئەو وتەیەی ڕۆلان بارتەوە نییە کە دەڵێت :

لەدایکبوونی تێکست، دەکاتە مەرگی نووسەر..بۆ؟ چونکە تێکستماڵی هەموومانە و هی کەسیشمان نییە.

*– دەڵێیت ئەو شیعرەی ئێمە دەیخوێیننەوە بۆ خۆی مەملەکەتێکە، ئایا دەتوانین بڵێین ئەو مەملەکەتە، مەملەکەتی هەموو ئەو کاراکتەرانەن کە لە ناو خودی شاعیردان؟*

+ بێگومان..، بەڵام من کێم؟ بە دیوێکیدا دەشێ هەموو ئەو منە تیرۆرکراوانە بێت کە نەیانتوانیوە زمانی خۆیان بێننە گۆ، تۆ زمانە لێ سەندراوەکانیان بۆ دەگەڕێنیتەوە. ئیدی هەموو ڕۆحی ئەو زمانانە جارێکی تر لە ڕێگەی سەمای وشە و عەقڵ و ڕوانینیانەوە – بوون– ی خۆیان پێ دەبەخشیتەوە.

هەموو ئەم وەسوەسانەی منیش پێودانگێک نییە ڕەوابوونیان بسەلمێنێت، تەنێ

خودی ئەو ماتەرانەیە کە بە ئازادی خۆیان لە ئازادییەکانی ئێمەش دەدوێن.

ئەو جوولە سروشتییەی وشە و ڕستە و وێنە و بیرکردنەوەی خەیاڵ و فەنتازیاکانە...کە زامنکەری تەمەن کورتی و درێژی خەونەکانی ئێمەشن.

– کەواتە شیعر قسە کردنە لە ناو عەدەمدا؟

+ دەکرێت یەکێک لە ڕایەڵەکانی عەدەم؛ ئەو فاسیلەیە بێت، کە هەوەڵجار بە بەرزەخ ناومان برد. هەر بۆیە سوهرابی سپهری لە خۆڕا نەیوتووە (عیشق سەدای فاسیلەکانە) کەواتە تۆ لەو عەدەمانەدا:

بوونی عیشقی خۆت، بوونی وجودیانەی خۆت، بوونی نەخوێندراوەی خۆت ئافەریدە بکەیت و بیهێنیتە وجود و بەوانی تریش بێژیت: منیش هەم..وەکو چۆن تۆ هەیت! تۆ بڵێی ئێمە توانیبێتمان یا لە دەستمان هاتبێت ئەو ئاسمانەمان دۆزیبێتەوە کە جێگەی هەموو منەکانی تێدا بێتەوە؟

– بوونی ئێمە لە کوێوە دەست پێ دەکات؟ لەو کاتەوەی چاوی بەرامبەر ئامادەیە، یا لەو کاتەوەی بە دووی پرسیاری شتە بچووکەکاندا وێڵ دەبین؟

+ من پێم وایە لە نێوان ئەو دوو گیربوونەدا هەم دەمرین هەم لە دایک دەبین. ئەوانی دی چەندێک هەق بە جێکردنەوەی خەونە بچووکەکانی تۆ دەدەن – واتە– چەندێک مانا گەورەکانی ئەو شتە بە ڕەسمی دەناسن و تێدەگەن، ئەو شتە بچووکانەی ماڵی تۆیە، هەمیشە ئەم کێشمەکێشەش هەیە.

– با بپەڕینەوە بۆ ئەو قسەکردنەشمان لەسەر مەرگ و ژیان، کە لە کوشتنی فاتیمەوە هات.. لە وڵاتی سوید و هەڵوێستی ئەوان و قسەی ئێوەش کە دەڵێیت: ئێمە هەموومان دژی کوشتنی فاتیمە بووین، ئەی کێیە فاتیمەکان دەکوژێ؟

+ ئەورووپا وەک هەر کۆمەڵگەیەکی زیندووی تر فرە ڕەنگە، گەرچی لە ئەقڵی کلێشەبازییانەی ئێمەدا شوێنی بەدڕەوشتییەکانە. من چۆن قسەم لەسەر ئەقڵی



کلێشەبازی خۆمان هەیە، ئاوهاش قسەم لە ڕوانینە کلێشەبازییەکەی ئەورووپاش هەیە. ئەگەر ئەورووپا ئیشکردنی ئەو دەزگا بیرۆکراتییانە بێت کە ئیلهامیان لە ڕوانینە ئۆرێنتاڵیزمەکانەوە وەرگرتبێ کە من بچکۆلەتر نیشان دەدات لەوەی کە هەم، بەو دیوەیدا جێی ڕەخنەی منە، لەبەرئەوەی ئەو دەزگا دووفاقەی خەمی فاتیمەکان لە من زیاتر دەخوا من گومانم هەیە! چونکە لە دواجاردا من وەک نەتەوە مامەڵەیەکی مێیانەم لەگەڵدا دەکرێت، کە لەو وێنانە دەچێت نێرەکان بۆ مێینەکانی دادەڕێژن!

ئەی ئەوە نییە ئەقڵییەتی نێرینانەی ئەو دەزگایانە هەمیشە بەردێک لە ئاسمان بکەوێتە خوارەوە دادگایی منی ڕۆژهەڵاتی پێ دەکەن، هەمیشە دەبێت بۆیان بسەلمێنم کە تیرۆریست و ژنکوژ و دواکەوتوونیم!

ئایا ئەمە هەر داوای نێرینەکان نییە بۆ مێینەکان؟

(منی مێینە، وەک نەتەوە، کە دێمەوە ناو ماڵەکەی خۆم ئەم تێکشکاندنەم).. ئەم بچووککردنەوەیەم لەسەر جەستەی مێینەکانی ناو ماڵەکەی خۆم خاڵی دەکەمەوە. من دووجار لەت بووم، یەکەم لەبەردەم ئەقڵییەتە نێرینەکەی ئەورووپا مێم..، جارێکی تر لەبەردەم مێی وڵاتەکەمدا نێرم! ئەمە ئەو لەتبوونەیە، دەبێت خۆم بەیەکەوەی بلکێنمەوە، بەڵام چۆن...؟ ئایا من وەک مێینەکی بەردەم پێودانگە ئەورووپاسالارییەکە بدوێم یا وەک نێرینەیەکی کۆمەڵگەی خۆم!؟ هەردوو ئەم وێنەیەش ئازارم دەدەن.

لەبەرئەوەی بە هەردوو بارەکەدا نێرینەیی و مێینەیی من، نێرینەیی مێینەیەکی داگیرکراو و نوقسان و موزەیەفە! بەڵێ منی موزەیەفکراو.. و.. منی داگیرکاو.. و.. منی نوقسانکراو، گەرەکمە هاو دەردەکانی خۆم بدوێنم و بدۆزمەوە، خودی ئەم دواندن و دۆزینەوانە بەو مانایە نین، دژە بەرەیەک دروست بکەم. بەڵکە بەو مانایەیە کە لێگەڕێین مێینە و نێرینەی کۆمەڵگەی من فێری ئاخاوتن بین لەگەڵ خۆیاندا (بەبێ دوکان و بازاڕی ئایدۆلۆژیستەکان) ئەم ئاخاوتنە پێ دەچێت زەمینە خۆشکەرێک بێت کە ئێمە بێ ترس لە یەکتر نزیک ببینەوە، لەو نزیکبوونەوەشدایە دەزانین لە چیدا یەکین و لە چیدا جیاوازین. لەبەر ڕۆشنایی ئەم قسانەدا، خۆم بە نزیکی ئەو هاوبیرە ڕۆژئاواییانە دەزانم کە لە کەشفکردنی ئازادییەکانی خۆمدا یارمەتیدەرم بوون.

ئەی هەر ئەو بیریارە ڕۆژئاواییانە نەبوون بوێرانە وێرانەکانی ژێر پێستی شارستانییەتی خۆیان بۆ بەیان کردین؟! هەر لەوێشەوە ئاسانکارییەکیش بۆ منیش فەراهەم بوو، تا منیش جورئەت بکەم لە وێرانەکانی خۆم بدوێم. ئا لێرەوەیە ناتوانم ئەوروپا بە یەکڕەنگ و بەیەک ڕایەڵ و ئەقڵییەت بخوێنمەوە، هەر کاتێک ئەوەم کرد توانای دۆزینەوەی دۆستەکانی خۆمم نییە. ئەو دۆستانەی کە دەخوازن دەرگای زیاتر بە سەر ڕوانینەکانی ئێمەدا بکەنەوە. ڕۆژئاوا بەو دیوەیدا قبووڵمە. بەڵام دیوە ستریۆتایپە بێرۆحەکەی و ئەوروپا و دیوە کرمەڕێزبووە سونەتییەکەی کۆمەڵگەی من، لە جەوهەردا لە گەڵ یەکتردا ئاشت دەبنەوە...و بە یەک ئالیەت ئیش دەکەن بۆ دابەشکردنی دنیا بۆ سەر دوو ڕەنگی مردوو و هیچی تر.

– کەوابێ بۆ دەڵێیت : بڕووخێ منی پیاو؟

+ دەمەوێت لێرەدا ئەوە بڵێم کە خودی شتەکان لە خۆیاندا بێلایەنن. ئەوە دەسەڵاتی ڕوانین و تەفسیرەکانن لایەنگرییان پێ دەبەخشن!

کە دەڵێم : بڕووخێ منی پیاو – واتە– بڕووخێ ئەو پیاوەی جێیەک ناهێڵێتەوە بۆ پلۆڕاڵیەتی دەسەڵاتی ڕوانین و تەفسیر و لێکدانەوەیەکی تر کە هی مێینەیە. ئەگەر ئەمە نەبوو، منی پیاو، منێکی تاکڕەهەندە.

هەر ئەوەشە دەبێ ئیعلانی مەرگی ئەو تاکڕەهەندییە بێفەڕە بکات.

ئەم خوێندنەوەیە، لە وەهمە نەخۆشەکانی خودی نێرینەیمان ڕزگارمان دەکەن. دەمەوێت بڵێم قسە لە جێیەک دەکەم، ئیعلانکردنی نێرینەیی و مێینەیی ئەفزەلیەتێک نییە!– واتە– بە کەمگرتن و زۆرگرتنی لایەنێک نییە، بەڵکو بۆ ئەوەیە چۆن تاریکی و ڕۆشنایی دەتوانن دڵداری لەگەڵ یەکتردا بکەن، بێ ئەوەی لە بیری ئەوەدا بن چۆن ئەم ئەویتر بسڕێتەوە. ئەم قسانەی من دەشێ جۆرێک لە وەهم بن، بەڵام ئێمە چۆن بتوانین ئەو وەهمانە ئاوەدان بکەینەوە و دەست بە جوانییەکانییەوە بگرین.

– چۆن دەکرێ ڕووناکی و تاریکی دوژمنی یەک نەبن و ئەو دڵدارییە چۆن دەکرێت؟



+ ڕاستییەکەی خۆشم نازانم چۆن، لە شیعرێکمدا هاتووە «گوێم لە دەنگی ڕووناکی مۆمە، ساتێک شیعر بۆ هاوڕێیەکەی تاریکی دەخوێنێتەوە» لای من ئەو دووانە ئاشت دەبنەوە، کە ئاشتبوونەوەی نێر و مێیە.

– *هەموومان دژی کوشتنی فاتیمە بووین، بەڵام کێیە فاتیمەکان دەکوژێت؟ ئەوشەڕە پێش ئاشتبوونەوەی تاریکی و ڕووناکییە، یا لە ساتی ئەو دڵدارییەدایە؟*

+ لە ناو هەریەک لە ئێمەدا کەسایەتی جیاجیا دەژین و هەناسە دەدەن، کەسێتییەک هەیە دەکرێت حەزی لە ناشیرینی بێت بۆ ناشیرینی، ڕووخان بێت ڕووخان، لەبەرئەوەی توانای دەمکوتکردنیمان نییە، ئەو ئێمە دەمکوت دەکات، فەرمانمان پێدەکات، تا ئەم دڕندەییە بگوێزینەوە بۆ دەرەوەی خۆمان.

لە ساتەوەختی ئەو گوێزانەوەدایە، تاقیکردنەوەکان لەسەر جەستەی یەکێکی تر جێبەجێ دەکەین.

فاتیمەش دەکرێ یەکێک بێت لەو مرۆڤانەی بووە قوربانی ئەو بوونەوەرە نەخۆشانەی ناو ئێمە. گەرچی پێشوەخت پێناسەم بۆ تاریکی و ڕووناکی نییە، بەڵام لە ساتی ڕوودانیدا ئەوە دیاری دەکەم.

گەرچی ئەو ڕوانینانەی دنیایان دابەش کردووە بۆ چاکە و خراپە، بۆرژواو پرۆلیتاریا، جوان و ناشیرین لە فەرهەنگی ئەواندا ئەم قسانە لە وڕێنە زیاتر نین. بەڵام خۆشحاڵم بە وڕێنەیەک کە من ناکاتە سەرباز و ڕۆبۆتی نێوان دەزگاکانی ئەو دنیایە.

ئەم کورتە دیدارانە لە چەند بەشێک پێکهاتبوون لە کوردستانی نوێدا بڵاوکراونەتەوە

# من ماسكم هەیە... من ماسكم نییە!

وای بۆ دەچم، ئەو ئافرەتەی نەخوازێ ئەگرەسیڤیەتی پیاوەکەی، هاوەڵی.. دۆستی.. هاوسەری دابمرکێنێتەوە.. ئەوا (ئاشقی.. خەمخۆری.. هاودەمی) پیاوەکەی نییە! ناتوانێ لە سروتێکی بێ سرەوتدا، ببێتە شیعر و پیاویش بە شاعیر. ناتوانێ ببێتە گوڵ و پیاویش بە باران. ناتوانێ ببێتە شەونم و پیاویش بە تیشکێکی مەلەوان.

گەر دوور دوور بڕۆم، من ئافرەت بە ئازادتر دەبینم لە پیاو! بەڵێ ئافرەتان لە دەرەوەڕا داگیرکراون و کۆیلەن وەلێ پیاوان لە ناوەوەڕا خۆیان داگیر کردووە و کۆیلەن! چونکە مرۆڤی ئازاد بەهێزە و میکانیزمە شاراوەکانی ئەو هێزەشە، ئیرۆسییەتی (ژیاندۆستی) لێ هەڵدەقووڵێنێ. کەچی ئێمەی پیاو – بوون– ێکی نەخۆش و تاناتۆسیمان (مەرگدۆستی) خولقاندووە! بنۆڕە... ئێمەی پیاو پاڵەوانی گشت شانۆکان بووین و هەین، بەڵام تۆمان کردۆتە کۆمبارسی سەرکەوتنەکانی خۆمان.

گەر (من)ی پیاو لە ناوی ناوەوەمدا بچکۆلەیی خۆمم بناسیبا، ئاوها بێ قەید و شەرت و نابینایانە، ئاشقە ڕووتەی خۆم نەدەبووم و ئەو نەخۆشییە بنیاتییەم، هێند نابینای نەدەکردم لە ئاست بێهێزییە ڕاستەقینەکەی خۆمدا.

هاتم و تۆم داگیرکرد، تا بڵێم: (منم بەهێز)! ئێمەی پیاو ترسنۆکترین مەخلوقی وجودین! دەنا ئاوهامان لە (جەستەی ڕۆحی) تۆ و (ڕۆحی جەستەی) وجود نەدەکرد! باشە..گەر لە ترسنۆکیمانەوە نەبێت، بۆ گەرەکمانە ئێوە بترسێنین..؟

گەر لە کۆیلەتیمانەوە نەبێت، بۆ دەبێت ئێوە کۆیلە بکەین؟! یەکەمجارە ئێمەی پیاو داوای بەزەیی لە ئێوەی بەهێز دەکەین، ئەوەش هێندەی تر بەخشندەترتان دەکات.

ئێوە جوانترن لە ئێمە، گەر ئێوە داوای بەزەییتان لە ئێمە بکردایە دەمانفلیقاندنەوە، هەروەک کردوومانە و دەیکەین!



کەچی ڕیاکارانە داوای ئازادیشتان بۆ دەکەین– لە کێ.. سیستەمەکان.. حکوومەتەکان.. دەزگا باوکییەکان... تاد.

– داخوا نازانین خۆمان سیستەمە بێ سیستەمەکانین و.. بێ سیستەمیەتە سیستماتیزەکراوەکانیشین؟

وێ دەچێ مرۆڤی ئازاد ئەوەبێ لە ناو ئەو مانایانەی چوونەتە ناو مێژووەوە واوەتر بچێ و مانایەکی دی بدۆزێتەوە بۆ خودی خۆی! خۆی هەڵنەداوەشێتە ناو چاڵە پڕکەتنەکانی ئایدۆلۆژیاوە، بگرە بەهاتنە دەرەوەی لەو چاڵانە، هەنگاو بەرەو ئازادی ئیرادەگەرییانەی خۆی بنێ، چی تر نەبێتە پەڕاوێز بۆ هیچ چەقێک و خۆی ناوکۆکەی دنیای خۆی بێ و لە بری کەسی دووەم و سێیەم نایەتە ئاخافتن و وەکو کەسی یەکەم لە (منی من) ناپرینگێتەوە و لەو هەنووکەییانەدایە دێتە گۆ!

کەسی ئازاد ناتوانێ ببێتە کۆیلەی کەس و لە دەستیشی نایەت کەس بکات بە کۆیلەی خۆی! کەسی ئازاد ناتوانێ (ساتۆرن)(*) ئاسا مناڵەکانی خۆی بخوات و، غەمسارد بێت لە بەرامبەر غەمەکانی ئەوانی دیدا.

لەو میانەدا کۆمەکی تۆ بۆ من ئەوەیە: چیدی مەیەڵە لووتی من لە بری تۆ بۆن بکات. چاوی من لە بری تۆ بڕوانێ. گوێم لە بری تۆ ببیستێ. زمانی من لە بری تۆ بدوێ. سییەکانم لە بری تۆ هەڵبمژێ. پەنجەکانم لە بری تۆ دەست لە شتەکانەوە بدات. تا نەیەڵیت زین بنێمە سەر پشتت و، تا نەیەڵم زین بنێیتە سەر پشتم!

ئاخر تا سنووری جیاوازییەکانی (منی نێرینە) و (تۆی مێینە) نەناسین و تێی نەگەین، ئەوا نازانین لە کوێدا یەک بین و.. بۆچی یەک بین و.. لە چیدا یەک بین!؟ گەر یەکیش بگرین، یا ئاشتیش بین، شتێک نییە جگە لە: (ڕاوگە و.. ساختەبازی و.. درۆ.. ناکامڵی و.. زۆرەملێی ناچاری) نەخوازەڵا (ئێمەی ڕۆژهەڵاتی کە سەربەخۆیی تۆمان پێ قووت ناچێ) کەچی مایەپووچانە دادگایی ڕۆژئاواش دەکەین!؟ ئەقڵی خۆت بەکاربهێنە وەکو خۆت تا ئەقڵی خۆم بەکار بهێنم وەک خۆم. تەنها (نا)ی ڕاستەقینەی خودی خۆتە– دەکاتە– خۆجیاکردنەوەیەکی کەینونییەتە خۆڕسکەکانت

(*) ساتۆرنی خواوەند مناڵەکانی خۆی دەخوات– واتە– کانیباڵیزم کە لە تابلۆی هونەرمەندی ئیسپانی (گۆیا)دا هاتووە.

له قـەڵەمڕەوی کـەینونیـیـەتە خـۆڕسکـەکانی ئەویدی و ئافـەریدە کـردنی هـاوکـێشـە هـاوتاکەی (ئیرادەیەکی ئازادیشە) لەو نێوەدا! چونکە:

– ڕۆشنگەری (من) سەرومڕ وا لە خودی خۆمدا

– ڕۆشنگەری (تۆ) سەرومڕ وا لە خودی خۆتدا

– ڕۆشنگەری (ئەو) سەرومڕ وا لە خودی خۆیدا

+ تۆ دەڵێی چی :

– داخـوا بـەو نۆرمـانەی کـە ڕوو لە کـرانەوەن، دەتـوانین هـەبوونـایەتی مـرۆڤـانەی خۆمان بپارێزین؟

له هـاووڵاتیدا بڵاو بووەتەوە

## نا بۆ (جنێونامەکان) و... نا بۆ (حوکمی قەرەقوشیش)!

یەکلاکردنەوەی چارەنووسی کەسێکی کورد بە 30 ساڵ زیندانی، بەپێی یاسایەک کە بۆ خۆی لە لایەن دوو ئیدارەکەوە (نەخوازەڵا نەتەوەوە) بنەمای نۆرم (Norm) و بەهاکانی یەکلا نەبۆتەوە. ناتوانێت تەزکیەسازو پارێزەری بەهاو نۆرمی بەرژەوەندییە – مادیی و مەعنەوییەکانی– ئینسانی کورد یاخود کوردستانییان بێت!

لە هەر ساتەوەختێکدا یاسا ڕۆشن نەبێت دەرهەق بە– ئەرک و ماف و ئازادییەکان– ئەو دەمەیە میزاجەکانیش لە تەمومژەکانی خۆیاندا مشتوماڵی هەموو شتەکان دەکەن و.. ئەوجا خواستەکانی خۆشیان دەسەپێنن بە (میزاجی حیزبی.. میزاجی گرووپەکان.. میزاجی تاکەکان.... تاد).

کۆمیزاجێکی ڕێکنەخراو و سیستماتیزە نەکراوە کە هەڕەشە لە (ئۆتۆنۆمیەتی میزاجەکان دەکات) و هەم زەمینەش بۆ (فەوزەوییەتی میزاجەکانیش) خۆش دەکات! لێرەوەیە....فۆرمۆڵبەند نەکردنی ئەم حاڵەتانەش – لە دوور یا نزیک ماوەدا– هەڕەشە کردنە لە (ئۆتۆنۆمیەتی دەسەڵاتەکانیش) کە بۆ ئێستا – حیزبسالارییەکانن– !

تەنها ڕێگەچارەیەکیش ئۆرگانیزەکردنەوەیەکی ئەقڵانییانەی ماتەرە ئۆرگانیزە نەکراوەکانی کۆمەڵگەیە. ئەمەش لەدوائاکامەکانیدا پەیوەستمان دەکاتەوە بۆ دەرچوون لە تەنگژەی گەڕەلاوژەکان و.. پۆلێنکردنەوەیان بەپێی نۆرمگەلێک کە گوزارشت بێت لە خواستی هەمووان.

بنەمای ئەم ڕاستییە سادەیەش لێبووردەیییەک (Tolerance)ێک دەخوازێ لە نێوان مەیل و بەرژەوەندییە جیاوازەکانی کۆمەڵگەیەک، گەر بخوازێ بەزیندوویی بمێنێتەوە، بەو مانایەی کارگێڕیکردنێکی ئەقڵانییانە نەک – ئایدۆلۆژییانە– بۆ بە ئەنجامهێنانی تۆڕەکانی وتووێژ و لێدوانەکان.

ئەمەش کۆتاییهێنانێک دەبێ بە بارودۆخی فەوزاکان و.. جێنشین کردن و



ڕاهێنانی تاک و گرووپ و حیزبەکان و دەسەڵات و بەها و نۆرمەکانیانە لەسەر (پەیمان بەستن) بۆ خواستە – بەڕێوڕەسم– کراوە جیاوازەکانیان. ئەم گردبوونەوەیەش لەسەر خوانی نەتەوەیەکی بەفام مەیسەر دەبێ. لەبەر ڕووناکی ئەم نووسینە کەم و پوختەدا، بۆخاتری پێکەوەهەڵکردن و نەخواردنی فرزەندەکانی خۆمان و قبووڵکردنی جیاوازییەکانی یەکتر بەگیانی لێبووردەییەوە، داوا لەو دەسەڵاتە کوردییە دەکەین کە (دکتۆر کەمال سەید قادری) زیندانی کردووە ئازاد بکات! باگوێ بۆ حیکمەتە فرە – وانە– کەی پیرەمێردیش ڕادێرینەوە کە دەفەرمووێت:

(کە ئاو داری لەسەر سەر ڕاگرتووە.. ئەیزانێ چی تیایە
لە لای نەنگە کە پەروەردەی نقووم کات.. گەورەیی وایە)!!

٢٣ی دیسامبەری ٢٠٠٥

## ماف و ئەركی گەنج

**ئاسۆ عەلی: لەم قۆناغەی ئێستای كوردستان ماف و ئەركی گەنج چییە؟**

**ئەنوەر:** بۆ ئەوەی لە بەراییەوە وشەی قۆناغ نەبێتە كۆت و بەندێک..، دەبێ وریا بین یەكێک لە مافە سەرەتاییەكان ئەوەیە قۆناغبەندییەكان لە دەرەوە و لەسەر حیسابی خواستەكانی گەنج نەبێت، بگرە بارگاوی و ئاوێزان بێت بە فرە ڕەنگی و فرەپرسیاری و فرە گومانی ئەو، كە لە جەوهەر و خەسڵەتە دیارەكانی گەنج خۆیەتی.

لە بەرامبەر تاكڕەنگی و بێ پرسیاری و گومانەكردنی دوگماكاندا كە چەقبەستووە لەسەر یەقینەكانی خۆی و ئامادە نییە دەستكاری ئەو چوارچێوە پێناسانە بكات كە بۆ دیاردەكان هەیەتی و پێی وایە خۆی مەرجەعی یەكەم و ئاخیرە بۆ ڕاستی و دروستی پێشبینییەكان، بۆیە هەمیشە قسەكەرە و بڕیار دەدات و فەرمان دەردەكا و گوێ ناگرێ، وە هەر شتێكیش لەگەڵ بڕیارەكانیدا نەبێت و یەک نەیەتەوە، بە نازانستی و ناكامڵ و زیادەڕۆیی هەرزەكارانە و فەنتازیای شاعیرانی دوور لە واقیع دەزانێ! كە نازانێ واقیع خۆی زادەی كارلێک و هاوكێشەی مەیلە جودا و پێک بەستراوەكانی هەناوی كۆمەڵگە خۆین كە مۆڵەت بە بوونی یەكتری دەدەن بەشێوەیەكی سروشتی بێنە ئاراوە و هۆشیارانە گوزارشت لە بنەماكانی خۆیان و هاوكارییەكانیان و یەكیەكبوونیان لەبەرابەر یاساكاندا بكەن.

ئەمەش پێمان دەڵێت: پێشنیار و ڕێگەچارەكان و ناولێنانەكانیش لە ڕێگەی پاراستنی ئۆتۆنۆمیەتی بیر و تێڕوانینە جیاوازەكان ئەكتیڤ دەبێتەوە و ماناش پەیدا دەكات. تا هەر گرووپە و وردە كولتووره بە ئیرادەوە لە كایەكانی خۆیدا كاربكات و شوناسی خۆی پێ دروست بكات واتە – (نمایشی كۆمەڵایەتی و ئەتۆمە كۆمەڵایەتییەكان – ج. مۆرێنۆ) بە هەند وەربگیرێن، تا لەو ڕێگەیەوە گرفت و كێشە و دژایەتییەكان چارەسەر بكەن.



گەنج پەرتی و نائۆرگانیزە بوونەكەیەتی بڕستی لێ بڕیوە و بە سانایی سەربەخۆییەكەی دەستی تێوەردەدرێت. چونكە تا ئێستاش هۆشمەندانە خۆنەناسە و شوناسە پینەكراوەكانی لە پێكهاتەكانی دەرەوەی خۆی قەرزكردووە و دەكات، داخوازی و زمانی ئەو داوایانەش بەكاری هێناوە و دەهێنێ بۆ هەڵبژاردنەكانی هی خۆی نەبوون و نین یاخود بە دەیان فیلتەری ئایدۆلۆژی و حیزبی و ئاسایشی كۆمەڵایەتی و نەتەوەییدا تێدەپەڕێنرێ، وەک ئەوەی گەنج هەر دەبێت ئامادەباش بێت بۆ بەجێگەیاندنی ئەركەكان و هەر كاتێكیش بێتە سەر مافەكان بە زیادەڕەو و قۆناغ نەناس دەمكوت بكرێت و پێی ڕابگەیێنرێ: (ئەی گەنج؛ وەختی ئەم داوایانە نییە)! بۆیە لە ئێستادا لایەنی كەم ئەركی گەنج ئەوەیە لە خۆی بپرسێ من كێم و فۆرم و ناوەڕۆكم بەندە بە چییەوە؟

*** لە نێو ئەو پێكهاتە ئاڵۆز و تێكقرنجاوانەی كۆمەڵدا لە كوێدام و كێیە بڕیار دەدات، جێگە و ڕێگەی خۆم و پراكتیكەكانم چی بێت؟ دەسەڵاتم دەرئەنجامی قورسایی ئامادەییەكانی خۆمە یا ڕەهەندێكی تر؟**

تا لە ڕێگەی ئەم پرسیارانەوە مەیلەكانی ناو خۆی كۆنكرێتر بناسێ و پۆلێنیان بكات و لە بوون و هێز و ئیرادەیان دڵنیا بێت. ئەگەر نا، نازانێ چۆن و بە چی خۆی جودا بكاتەوە لەو حەز و نیازانەی بە دنیاكەی ئەو نامۆن. هەر ئەوەشە دەبێتە باعیسی ئەوەی ببێتە پاشكۆی هێزەكانی دەرەوەی خۆی، كە گوزارشتی ڕاستەقینە لە پێگەی ئەو ناكەن، بەڵكە وەكو ئامرازێک و هێزێكی یەدەک لە تەنگانەكاندا بەكاری دەبەن.

ئەگەر گەنج دەربەستی ئەم ڕاستییە سادەیە نەیەت، هەمیشە لە كەسێكی بارمتە كراو دەچێت، كە ئیرادەی زەوت كراوە و بۆشایی دەسەڵاتدارەكانی تر پڕ دەكاتەوە.

جا بۆ ئەوەی چیتر مافەكانی وەكو شەفەقە و دەستكەوتی شۆڕش پێ نەفرۆشرێ.. ناچارە لە ساتە چارەنووسسازەكاندا لە هێزی خۆی بەهرەمەند بێ و هەر بەو هێزەش داكۆكی لە بەرژەوەندییەكانی خۆی بكات، كە دابڕاو و ناكۆک نییە بە بەرژەوەندی و زەینییەتی گشتی كە خۆی بەشێكی ئەسڵیەتی.

ئەزموونەكان پیشانی داوە گەنجی ئێمە گرفتی ئەسڵی ئەوەیە: تا هەنووكەش

ئیلهامی لە ژێرخانی هەبوونایەتی خۆی وەرنەگرتووە و بە چەک و تفاقەکانی مەعریفەی خۆیشی بۆ ویستەکانی نەجەنگاوە. ئەمەش باجێکی کاڵفامانەی وەهای پێ داوە، هێندەی شەڕی هەیبەتی باوکەکانی کردووە... نیو ئەوەندە بە تەنگ هەیبەتی خۆیەوە و کرانەوەکانی نەبووە و تەنها خۆی بە ڕەنگدەرەوە و سێبەری باڵای باوکەکانی زانیوە! باوکەکانیش لە بری ئەوان بیریان کردۆتەوە و بەناوی بەرژەوەندی گشتییەوە لە مەنگەنەی ئەمر و نەهییەکانیان داون و ڕاڤەکار و یەکلاکەرەوەی مەترسی و ئاڵۆزییە سیاسی و کۆمەڵایەتی و مۆراڵی و پەروەردەییەکان بوون .

بۆیە تا ئێستا گەنج جورئەتی ئەوەی نەکردووە بڵێت: من چیتر تەنها غولام و خزمەتکار نیم و دەبێ بە قەد قوربانی و تواناییەکانم ڕێزم لێ بگیرێ و گوێم لێ بگیرێ و مافی هاوولاتییانەی خۆمە لە هەموو کاروبارێکدا بە ڕێکەوتن بێمە پێشێ لەگەڵ پێکهاتەکانی تردا، ئەمەش ناکات لەبەرئەوەی بێ شوناسییەکەی زارەترەکی دەکا و دەیترسێنێ کە بە زۆڵ و دەمدرێژکردوو و ئاژاوەچی و یاخیبوو ناوی ببەن.

لە کاتێکدا هیچ شتێک بێ ڕۆڵی ئەو نە فۆرم وەردەگرێت، نە بەردەوام دەبێت، نە دەچێتە پێش، نە ئەنجامێکیشی دەبێت. گەنج لەو کرمی ئاوریشمە دەچێت کە دروستکەری ئاوریشمەکەیە و کەچی خۆی لێی بێ بەرییە.

دەشێ گەنج کاڵفامی و بێ ئیرادەیی خۆی بێت بەقەد قوربانییەکانی دەستکەوتی مادیی و مەعنەوی نەبووە و نییە. ئەم گرفتە مۆزمین بوونانەشە کارێکی وەهای کردووە کە گەنجی ئێمە دەڕوانێ و ئاوڕ دەداتەوە هیچی وای بۆ نەکراوە، بەمەش تووڕە دەبێ و خوتەو و بۆڵەی دێ بەڵام ڕەخنە ناگرێ چونکە گوتاری ڕۆشنی خۆی نییە و بە چەندین میتۆدی جیاواز خۆی نەپشکنیوە و دیالۆگی لەگەڵ ئیقاعەکانی خۆیدا دانەمەزراندووە و گەر جووڵەیەکیشی پیشاندابێت لە ئایدۆلۆژییەتێکی تایبەتەوە بووە کە پێی گۆش و گوێڕایەڵ کراوە یان شەرمنۆک و بێدەنگی کردووە.

بۆیە گەنج تا لە مانا قووڵەکانی گەنجێتی خۆی حاڵی نەبێت و دیدەوانی بەها و نۆرم و ڕەمزەکانی خۆی نەبێ و نەناسێ، ئەوە هەر بەسەر چەندین ناوی تێکەڵ و پێکەڵدا دابەش دەکرێ و شەڕیشیان لەسەر دەکات، کە ئەو ناوانە لە دواجاردا شتێک نین و نابن جگە لە ململانێ و ناکۆکییەکانی دەسەڵاتەکانی دەرەوەی خۆی



زیاتر، کە هەموویان لە گۆتکردن و نابووتکردنیدا دەستیان هەبووە و هەیە!

گەنج مافی خۆیەتی گشت دامەزراوەکان بخاتە ژێر پرسیارەوە و گومان لە نوێنەرایەتییان بکات و بە ڕێگەی دیالۆگ و ئارگۆمێنت بە خۆی و ئەوانیش بسەلمێنێ تەنها ئەم ڕێگەیە لە دەست قەیرانەکان ڕزگارمان دەکات و زەمانەتی ئالیەت و میکانیزمەکانی ماف و ئەرکەکانیشمان دەکات کە هەژمونگەری تەڵاق دەدات و نابێتە پاوانخواز و باوکی گشت ماناکان. جگە لەمە پەکخستنی هەموو هەوڵێکە کە متمانەمان بۆ بگێڕێتەوە کە بە ئاسایش بەیەکەوە پەیوەست بین و لە ڕێی تۆڕی نۆرمگەلێکەوە کە هی ئیرادەی هەمووانە و بە یەکسان دەمانگرێتەوە لەگەڵ یەکتردا بین. ئەم ماڵەش کە ناوی نیشتمانە بۆ سەقامگیرکردنی ژیانی سیاسی و کولتووری و وجودی هەمووان بێت. دەنا هەر قسەکردنێک لە دەرەوەی ئەم ڕاستییە سادانە تەنها و تەنها باوەخولێ و پێچە بە دەورەیە و بەس!

لە ڕۆژنامەی خەبات ژمارە ٢٤٤٥ بڵاو کراوەتەوە

## خود نەخوڵقان... خود تەقاندنەوەیەک نییە؟

خۆتەقاندنەوە تەنێ مەترسییەک نییە لەسەر پەلوپۆ خستن و گچکە کردنەوە و هەلاهەلاکردنی دەستبلاوی و دلاوایی و عیشوەگەری نیگا نووربەخشەکانی خود و بەس، بەڵکو سڕینەوەی پایە و بنەچەی دابونەریتی هێزە پڕ پرشنگەکانی شکۆی خودیشە....!

ئەو خودبێوەرییەی self denying بەر لە هەرکەس پشتشکێن و پشتێکەری ویستی خۆدارییانەی ڕۆح و جەستەی خۆیەتی.

خودبێوەرییەک نەتوانێ بە پایەبەرزییەکانی گیانی خۆی.. دڵی خۆی شادبکات، ناتوانێت و لە دەستی نایەت ئارامییەک ڕێنوێنی بکا و، ئازاری دەروونی دەوروبەرەکەی نەدات.

خودبێوەرییەک نەتوانێ جوانییەکانی ژیانی خۆی بدۆزێتەوە و بخوڵقێنی و کەوی بکا.. ناتوانێت و لە دەستی نایەت کەوی تەوتەمێک نەبێ و تاغوتێک بەسەر سەری خۆیەوە نەخوڵقێنێ، تا هەستی بێڕەزاییانەی خۆی و غولەکەی لەسەر لەوحی دەروونی یەکتر هەڵنەکۆڵن و جەستەی ژار و زووخاوی نیازخراپیان لە سەرمەشقییەکانی یەک هەڵنەسوون و بۆ تازەکردنەوەی هێنانە زمانی شەڕەنگێزییان لیک لە دەمی بێویژدانانەی یەکتر قەرز نەکەن و نەتکێنن.

خودبێوەرییەک کە بەختیارییەکی ڕووڕاستی نەبێ بۆ بەخشین؛ جگە لە دەرفەت بۆ دڕییە هەزار ڕووەکەی چی تر ببەخشێ..؟ مەگەر چزووی پێوەدان چونکە خۆیشی پێوەدراوە. تۆ بڵێی لە زەوی بێزەوقی بەدخوازیدا، زوڵاڵی چاکەخوازییەک ئەهوەن.. ئەهوەن هەڵبقوڵێ..؟

خودبێوەرییەک دەروونی.. ڕازی.. هۆشی.. خواست و خولیای ناپاک و نەحەساوە بێت؛ لەدەستی نایەت و مەحاڵێکە؛ خۆبردووانە پەسەندخوازێکی پاک و حەساوگەش بێت بۆ کەسی تر.



خودبێوەری سەراسەر گەوجێتی چارەنووسەکەی لەوەدایە ؛ بە ورەوە خۆبەختکەرە بۆ ئامانجگەلێکی خواروخێچی بێ بەڵگەی وەها کە پڕە لە بەدبەختی بۆ کامەرانییەکانی خۆیی و بێ حورمەتی کردنیشە بە جوانی و چێژی لێبووردەییە جۆراوجۆرەکانی ئیمان، کە لە قووڵاییەکانیدا بەو جوانی و گونجان و تەبایی و لێبوردەییانە ڕۆحپۆش و سیخناخ و بارگاوییە. کە ئاوێزان بووە بە دەنگ و ڕەنگ و بۆی ڕۆح و مانا دینامیکی و ستاتیکییەکانی جەستە.

ئاخر ناکرێ دەروونێکی ناپوخت و وشک و دەغەزار و ڕەق بیت و، بخوازی دۆستی فریشتە خووت هەبێ.

کۆیلە و کەودەن بیت و ڕۆح شەلاڵ بیت بە بوێری و ڕۆشناییەکانی ئازادی.

بێ باڵ بیت و بخوازی مامۆستای خۆشگوزەرانی بەرزە فڕینەکان بیت. گەرچی (مرۆڤی ئازاد لە فیکری مەرگدایە، بەڵام حیکمەتی ئەم مرۆڤە لەوەدا نییە کە بیر لە مردن دەکاتەوە بەڵکو بیرلە ژیان دەکاتەوە – سپینۆزا–)

خودبێوەرییەکی فریوخواردوو ستایشکەرێکی لە خشتەبراوە کە پشت ئەستوورە بە هەڵوەشاندنەوە و وێرانکردنی هەناوی دنیا و ژیانێک، کە نەگونجاوە بۆ پارێزگاری لە فەرمانڕەوایەتی وەهمە مەزهەبی و ئایدۆلۆژییە ڕۆحپەڕیوەکانی ئەو. ئەو وەهمەی وێستگەی ئەو دیدە بە بێزانەیە کە بە بەهانەی گەڕانەوەی حورمەت بۆ ڕۆح؛ دەبێ بێحورمەتی بە جەستەیەک بکەیت کە بووەتە زیندان و سەبەبکاری ئازاد نەبوونی ئەفسانەکانی ئەو ڕۆحە! ئەم متمانەیەش لەسەر دەستی ئەوانەدا بەڕێوە دەچێت کە لە پێش هەر شتێکدا توانای خۆ بە تەوتەم کردنیان هەیە لەسەر ئەو ڕۆحە نەخۆشانە، تا ئەم جەستانە ئامادەیی خۆ بە قوربانکردنیان تیا هەبێت.

واتە بۆ خاترجەمبوون و پاساوانیکردنی دەسەڵاتی ڕەهای تەوتەم؛ خۆت و ئاگاییت فەرامۆش بکە.. تا دنیایەک کە جێی خراپترین خراپەکانە کۆتایی پێ بێت!

ئەم ئەزموونەش مەیسەر نابێت هەتاوەکو لە نێوان جەستە و ڕۆحدا هەڵبژاردنێک یا دروستتر دابەشبوون و یەکلاکردنەوەیەک ڕوونەدات! ئەو مافی بوێرییەش بە کەسە خۆتەقێنەرەوەکەوە پەیوەست نییە تا دەستنیشانی ئاراستەکانی بکات، بەڵکو ئەوە پێشگۆیی پەیک و بانگهێشتنی تەوتەمە؛ ئەم تاقیکردنەوە بە دیمەنکراوە موعتەبەر و

پیرۆز دەکات بۆ گوێڕایەڵەکانی و زمانزالانە و فەرماندەرانە پێیان دەڵێت: لە دوای فیداکاری فەزیلەتەکانی دڵ و مێشکی ئێوە، کە بەشداربوون لە سەرەونگۆمکردنی سەرچاوەکانی ئەو دنیا پۆخڵبووە بە شاوەتبازی شەیتانەکان.. جەستە نارەسەنە بێلایەنەکانیش کە تا ئێستا دوودڵن و ئیمانیان نەهێناوە بە ڕێگەی هەقی ئێوە، ژیانیان کە نایابترینیانە بۆیان؛ با نەمێنن. سەرکەوتنی ڕاستەقینەتان ئەوەیە کە لە ڕێگەی جەستەتانەوە خۆ و ئەوی تر تەفروتووناکردن، گەیشتنە بە شادی و گەورەترین لەزەتی ئیمان! (هەرکەس نەتوانێ بە فەرمانی خۆی بکا، فەرمانی لەسەر دەدەن –نیچە–)

ئەو دڵ و مێشک و جەستەیەی کە چیتر ئۆقرەگرتوو تاپۆکراوی خۆتەقێنەرەوەکە نییە و، سروشت و تاراجی هەموو شتەکانی بووە بە هی ئەو – واتە– ڕاوێژ و فتواکانی تەوتەم .

لێرەدایە کە شادی بریتی نەبێ (لە شادی بیر کاتێک دانایی و زانین وەردەگرێت.. وە چێژوەرگرتن کە هی جەستەیە و خۆشی پێدەگەیێنێت –پرۆدیکۆس–)

ئەوە تامەزرۆیی خەیاڵ خاوی و ئەندێشە لغاونەکراوە بە قسەهاتووەکانی تەوتەمە، لە دابونەریتی خومخانەکەیدا دەتوانێ ڕەنگی هەموو نادادپەروەرییەک بە دادپەروەری و.. هەموو نادینییەک بە دین لای موریدە بیر و جەستە خەسیوبووەکانی ساغ بکاتەوە! بۆیە (زەحمەتە مرۆڤ بە ڕاستی چاک بێت، گەر لە جەستە و بیریدا تەندروست نەبێت– سایمۆنیدێس–)

کەوابێ بۆ ڕۆچوون و ناسینەوەی نەخشە و فەرهەنگی خۆتەقاندنەوەکان و دنەدەرەکانی، دەکەوینە بەردەم چەمک و دەستەواژەگەلێک کە ناکرێ چاوپۆشی لێ بکرێ و نابینا بگیرێت و ڕاشکاوانە ئالیاتەکانی ئاوەڵا نەکرێن وەکو بایەخەکانی: خود و.. دابونەریتەکانی/ خود و.. دنیاکەی/ خود و.. ماهیەتەکانی/ خود و.. تەوتەم و باوەڕ و دانپیانانەکانی /

لێرەوەیە تێدەگەین چین ئەو شتە ناقۆڵایانەی خود بە مایەپووچییەکانی بەند دەکەن و دەیکەنە بابەتی زەربە و دروستکردنی نەفرەتییەکانی دەرککردنی تەوتەمییانەی خۆیان نەک بەپێچەوانەوە! کە خود بڵێت: (من بە هەموو شتێکمەوە



تەنها جەستەم؛ ڕۆحیش تەنها وشەیەکی ڕەهاکراوە؛ بۆ دیاریکردنی بەشێکی ئەم جەستەیە – نیچە–) ڕەچاو نەکردنی ئەو ڕایەڵ و هێمایانەی هەرێمی سەرەوە، دەکاتە نەچوونەوە سەر نرخی دەستبەسەراگیراوی ئەو خودە تاسە نەژیاو و ویست شکست و ئەفیونخواردووانەی (ڕووبەری باوەڕیان لە ئەندازەی بیرکردنەوەیان زیاترە – نیچە–).

بۆچی ساتەوەختێک باوەڕ وەک یەکێک لە پشکە جیاوازەکانی ناو ئێمە؛ جبەخانەی هەرا و زەنای یەقینە سەپێنەرەکانی خۆی پان دەکاتەوە بەسەر تەواوی وتووێژ و پێکهاتەکانی ترماندا و، دەبێتە زمانحاڵی کۆی وزەکانی بیرکردنەوە و ئەندێشە و ئیرادە و نائاگایی و مەزنە و چالاکی و گشت حاڵەتەکانی ترمان و چۆکیان پێدا دەدا، یەکەندەر و نیشانەکانی سەروسەکوتی تەنگژەی دەمارگیریش سەر هەڵدەدەن؟

چونکە دەبێ لەو نەزانینە نهێنیدارەی بوونی فەرهەنگە هیوابڕاو و هاکەزاییەی خۆمان حاڵی ببین کە :

(ئێمە لە چەندین بەشی جیاواز دروست بووینە کە هەر یەکەیان حەزی بە دەرکەوتنە و ئێمە تەنها دەتوانین بەرپرسیارێتی ئەنجامی ئەم ڕێکەوتنە وە ئەستۆ بگرین؛ نەوەک حاڵەتی دەروونی هەر بەشێک – ئیرڤین یالوم ئێم.دی–)

٢٠٠٧/٢/٦

لە هەفتەنامەی جەماوەر ژمارە ٢١١

## کوردی پاشکست.. هەنگاوی چ بنێت!؟

بیرکردنەوە پێیە، نەبوونی پێ هەڕەشەیە لە هەنگاونان. هەنگاویش لە خۆیدا هێزێکە؛ ئیرادە بۆ چارەنووسی خۆی دروستی دەکات! چارەنووس.. پێی دووەمە و، لەدووی هەنگاوی یەکەم کە (بیرکردنەوەیە) هەڵدەگیرێت. نەبوونی هەریەکێک لەو ڕەگەزانەی (بیرکردنەوە و چارەنووس)ە ئیفلیجییەک پایەدار دەکات، کە لە نزیک ماوەدا مانای ئیفلیجی وجودی دەگەیەنێت. لەبەرئەوەی وجودێکی ئیفلیج توانای تێپەڕاندنی خۆی لە دەست خۆیدا نییە. چونکە ماهیەتەکەی هەمیشە چاو لە دووی گوروژم و هیدایەتێکە لە دەرەوەی خۆیدا، هەتا جووڵەی پێی ببەخشێت. واتا ئەوی تر.. قەدەری ماهیەتیەکەیەتی، گەر کۆمەکی پێ کرد ئەوا گەشبینە و ئەگەر نا ڕەشبینە! بەڵام نازانێت بە قەدەر مەزنی تانوپۆی ئیرادەکانی خۆیەتی.. قەدەریش وەڵامدەرەوەی خواستە مەزنەکانی دەبێت. دەرکنەکردنی ئالیەتەکانی ئەم میکانیزمەیە کوردی پاشکست کردووە و لەبری هەنگاو؛ خشۆکانە سنگەخشێ دەکات بە دوای ڕووداوەکاندا و گلەیی لە دەست چەرخی چەپگەردکردنیش پاکانە و پاساوێک بووە بۆ خۆ پەڕاندنەوە لە لێپرسراوییەتەکانی؛ لە بەرامبەر پرۆژە مێژوویی و ئێتیکی و سیاسی و وجودییەکانی! ئەمەش گلەییکردن بووە لە ئۆبجێکت کە لەگەڵ سۆبجێکتدا یەک نایەتەوە، بۆیە لێرەدایە ماهیەتی سۆبجێکت شتێک نییە جگە لە وجودی ئۆبجێکت زیاتر. ئۆبجێکت سەنتەرە و سۆبجێکت پەڕاوێز؛ ئەمەش لە تۆتالیتارییەتی مارکسیەت و مەزهەبەوە (من ذهب علی طریق) بە میرات ماوەتەوە بۆمان!

هەرئەم پرۆسەیەش وای کردووە ئیندیڤیدواڵیزم لە فەرهەنگی کۆلێکتیڤیانەی ئێمەدا بوونی ڕاستەقینەی خۆی نەبێت و، تەنها و تەنها دەستی دووەم و سێبەری کۆلێکتیڤییەت بێ و هیچی تر!!

بۆ پێ هاویشتنە مەرزی هەزارەی سێیەمینەوە هیوا قادر لە گۆڤاری ڕەهەند ژمارە ٩- ١٠ پرسیارێکی بۆ نێو زاکیرەی ئێمە وروژاند «تۆ ئەی ئەو مرۆڤەی کە





شەڕی شوناسی کوردبوونی خۆت دەکەیت، ساڵی دووهەزار پێوەدانی دوا قاپییە لەسەر سەدەیەکی تر لە جەنگ و کوشتنی تۆ. تۆ بە خەون و نائومێدییەکانتەوە کە بەرەو هەزارەی سێیەمین دەچیت، چۆن لە خۆت دەدوێیت؟ هیوا قادر» گەرچی ئەم مەلەفە حەوت ساڵی بەسەردا چووە، کەچی ئیرادە هەر پاشکست و کوێر و کەڕ و لاڵە لە سنووری باوەخولێکانی خۆیدا. ئیرادەیەک کە دەشێ کۆبەندی وردەئیرادەکانی نێو خۆی بێت و ئۆرگانیزەبووی گشت ئەو ئیرادانە بێت کە لە یەکتر ناچن؛ لێ لە دواجاردا ئیرادەی نەتەوەیەک بن کە خۆی هەڵچنیبێ بە وردەئیرادەی وردە کولتوورەکانی نێوەهەناوی خۆی.. کە دەکاتە پرۆژەیەکی فرە ڕەهەند بۆ جەستەی نەتەوە. جەستەیەکی قایم، کە دەرئەنجامی قایمی کۆئەندام و ئەندامەکانێتی کە بە هارمۆنیکیەتی نێوخۆیان ستراکتۆریەتی تەوەرە کراوەکانی خۆیان ڕۆدەنێن.

لێ حاڵی هەنووکە چۆنە و بۆ وەها دووبارەبوونەوەیەکی پڕگەڕەلاوژەی نەزۆکی بێ شوناس و ڕوونبوونەوەی چەمکی ئیرادەو بیرکردنەوە و هێز و قەدەر بەرقەرارە..؟ پێم وایە ئەو ئاماژانەی باعیسی ئەو شکستییەن کە لەپەسا وەجاخکوێرییەکەی خۆی بەرهەم دەهێنێتەوە، کورت و پوخت پێ دەچێ ئەمە کێشە ئەسڵییەکە بێ؛ کە لەم وتارۆکەیەدا هێڵە گشتییەکانی هاتووە، با چاوێکی پیا بخشێنینەوە:

«بە خۆم نییە.. من ئیستێک دەکەم لەسەر ئەو گوزارە ڕاگوزارەی لەبان زمانم شین دەبێ و پێم دەڵێ: تۆ بڵێی پێش دوو هەزار، مێژووی هەرەس و کەتن و کەوتنەکان بوویێتن و دوای دوو هەزار هەستانەوە بێت..؟ بەو واتایەی ئێمە لە جووڵەی ڕاستەقینەدا بین لە بێ ئومێدییەوە بەرەو ئومێد و، لە بێ خەونییەوە بەرەو خەونگاکان و لە زیندانەکانەوە بەرەو گزنگەکانی ئازادی....!؟

تۆ بڵێی: بۆ پێکاندنی ئەو ئامانجەی دەخوازم بیناسم و تەماهی لەگەڵ فەزا نادیارەکانی ڕۆحیدا بکەم، ئەم دوو پرسیارەی دۆرین درێند دەستگیرۆییم نەکەن؟!

یەکەم: دەمەوێ چی بکەم و چی بهێنمە دی؟

دووەم: لە واقیعدا چی دەکەم و مومارەسەکەم چۆنە؟

وێ دەچێ هەر لە دەروازە بێ شوناسەکانی ئەم ڕەوەندە بێ وەڵامەوە بێت، بچمەوە

سەر پرسیاری، ئەو گومان و کەڵکەڵە سەرەتاییەی کە بۆ منی بێ شوناس و گومناو دەبێتە ئەسڵێک.

– داخوا کورد وەک نەتەوە و یەکەیەکی گشتی «شوناسی مرۆڤی»ی پێ دراوە..؟

– داخوا کورد «مافی مرۆڤ» وەک تەنێکی تایبەتی زیندوو دەدا بە «من» و ئێندیڤیدواڵیەتەکەم پێ ڕەوا دەبینێت؟

دەرهەق بە پرسیاری یەکەم، هێندەی ئەزموون و ڕاستییە باو و باڵادەستەکان لە ئاستە گلۆباڵییەکەیدا «جیهانی» نیشانی داوین.. بێ سڵەمینەوە نەء! بۆ ئەوەی ڕەسمییانە بناسرێیت، دەبێ شوناست سەر بە شوناسی ڕەسمی دەوڵەتە جەللادەکانت بێت.

ڕۆژهەڵاتناس و گەڕیدەکان و جاسووسەکان بە چ چاوێک تۆیان دیوە و بە چ میتۆدێک خوێندوویانیتەتەوە و ناسیویانیت، وە بە چ ئەقڵییەتێک تێتگەیشتوون و بە چ زمانێک لە بارەتەوە ئاخاوتوون ؛ ئەوە دۆکۆمێنتی شوناسەکەتە!

لە پرسیاری دووەمیشدا ، لەسەر ئاستی لۆکاڵیدا «ناوخۆیی» دەرهەق بە (تاک و تەنیا) کان هەر نەء! ئێمە لەو فرزەندانە دەچین کە لەلایەن ئەو باوکانەی دووچاری نەخۆشی کانیباڵیزم هاتوون خوراوین! لە هەر یەکێک لەو بوارانەدا (گلۆباڵ و لۆکاڵی) نەناسراو و نەخوێندراوەم! هەنووکە بەپێی پێوانە گشتییەکان من لە نەبوون و مەحاڵدام. کەچی «نەبوونناس» و موسافیرەکانی ناو «مەحاڵستانەکان»یش نەیانناسیووم ئێستاکەش نامناسن. بگرە مافی شێت و زیندانی و هۆمۆسێکسواڵیشیان پێ ڕەوا نەبینیووم.

منی نیشتەجێی نەخشە نادیارەکان و پەڕاوێزی پەڕاوێزەکان، چیم بۆ ماوەتەوە لە هەموو ئەو میراتییانەی «کۆتایی» سەدەی بیستەم و «سەرەتای....؛ دەستپێکردنی هەزارەی سێیەمینەوە» کە هەڵگری مژدەیەک بن بۆ من «منی ئێندیڤیدواڵ»؟!

گەر سادەدڵ نەبم و نەترسم لەوەی پێم نەگوترێ پووچگەرا ، پێم وایە «هیچ»! من تەنها ئاسمانێکی بێ پایان، تەنها زەوییەکی بێ زۆن تانوپۆی شکستەکانی خۆمی تیا بنوێنم «هیچە»!

– داخوا باڵەکانی مینەرڤا– خوداوەندی ژیری– شک دەبەم کە ئەو ئاسمانە



«هیچ»انەی پێ تەی بکەم و بیناسم و لەسەر زەمینی ئەو «هیچ»انەشەوە دەست پێ بکەم؟ ئەو هیچەی لای من ستیوارت– بەو مانایە ناسی دەکات «کە لە نێوان ڕاست و درۆدا هەمیشە بوارێک هەیە بۆ ئیمکانییەتی سێیەم کە ناوی – بێ مانایییە–» بەڵێ.... «بلیمەتی مرۆڤ لەوەدا دەرناکەوێت کە تەنها دەست بە لایەنێکەوە بگرێت، بەڵکە ئەوەیە کە لە یەک کاتدا دەست بە هەردوو لایانەوە بگرێت، هەر لەو کاتەشدا خەریک بێت بە گشت ئەو بۆشاییەی – کە دەکەوێتە نێوان ئەو دوو لایەنەوە– پاسکال–» ئەگەر نا هەر ونبوویەک دەبین، لەو ونبووندا و شوناسمان بە وێنەی ئەو لانەوازە سەرگەشتەیەی لێ بەسەردێت، کە لە دەرەوەی شارەکانی هۆشیاریدایە و (حسی)انە لەبەر خۆیەوە دەبڵمێنێ: «کێ شارم نیشان دەدات؟!» ئاخر سەفەرنامەی تراژیدیاکانم پێم دەڵێن.. فریادڕەسێکی تاقانەش نەماوە؛ دۆستانە شاری ژیان و بوون و شوناسەکانم پێ نیشان بدات.

دەشێ هەر لە خۆمدا شار و ڕێگە و دەرگا بۆ شوناسەکانم بخوڵقێنم. بەڵێ «هەر کەسێک بیەوێ ئازاد بێت، تەنها دەتوانێ لە ڕێگەی تواناکانی خۆیەوە ئازاد بێت، ئازاد بوون هەرگیز بە پەرجوو لە ئاسمانەوە بۆ ئێمە مەیسەر نابێت – نیچە–» مەرگەسات ئەوەیە فریادڕەسەکانیش مردن. ناچار دەبێت بە قەد ئەندازەی هیمەتی ئەو «گایەش بێت بە ئیرادەی خۆی شاخی لەسەر سەری خۆی ڕواند – شۆپنهاوەر–» لە نەبەردی ئیرادە بەهرەمەند بم.

ئێمەی سەرنشینانی ئەو کەشتییەی لە دەریادا سووتا، پاش و پێشمان شەڕە و شەڕە و شەڕ! شەڕی ئاماژەکانی شوناسی ئەقڵ.. شوناسی جوانی.. شوناسی شەڕ.. شوناسی شوناس و.. تاد

هیچ ئیختیارێک نەماوە، جگە لە جەنگی جەستەی ئەقڵ و دەروونی ئەقڵ و دڵی ئەقڵ زیاتر. لەم سەردەمی بەرزەفڕییانەدا؛ نە باڵم باڵی مینەرڤایە بۆ فڕین و نە قاچیشم قاچی کامیلایە، بۆ بەشداری لە ماراسۆنی بەخششەکانی ژیان (کامیلا: لە میتۆلۆژی ڕۆمانیدا بەو ئافرەتە دەگوترێ کە پێش با دەکەوێ و بەسەر ئاودا هەڵدێ و بەسەر گوڵە گەنمیشدا ڕادەکات بێ ئەوەی هیچی لێ بپروێ) من لە هیچ یەکێک لەو شەڕ و گەمانەدا بەڵەد و کردە نیم! مەگەر هەر لە دواوی دواوە لاسایی شەڕکەر و

یاریزانەکان بکەمەوە...، لاساییکردنەوەش نەبەردی ڕاستەقینە نییە!

لەوەتی بیرم بێت یادەوەریم دەڵێت: من تەنیا دووکەڵی ئاگرەکان و لە پێشی پێشیشەوە سووتەمەنی نابەڵەدی و کەودەنییەکانی خۆم بووم.

کەوابێ منی خشۆک، بۆ ئەوەی تا ئەبەد مەحکوم نەبم بە فۆرمە ئاشنا و نائاشناکانی مەرگ و مەرگەسات. ناچاردەبم «شاخ لەسەر سەری خۆم بڕوێنم» چونکە نە موعجیزەیەکی تر.. نە غەیبانییەتێکی تر.. نە هیچ فریادڕەسێکی تر نییە بە هانامەوە بێت. تەنهاو تەنها ڕێگەکانی بیرکردنەوەی خۆم نەبێت. هیدایەتکردنەوەی ئیرادەی هێزە کوێرەوەبووەکانی خۆم و تەقاندنەوەیان بۆ خاتری هەڵکۆڵینی ئەگەرێکی تر بۆ جیلوەکانی ژیان.

کورت و کۆتا پڕکردنەوەی ئەو بەرەهوتە فیکری و ڕۆشنبیری و ئەخلاقی و مەعریفییانەی گشت ڕووبەر و پانتایی بنیاتەکانی بوون مانی پایەماڵ کردووە بە ئیرادەگەری پڕ بکرێتەوە. وەختە بڵێم بە جۆرێک لە- ئیرادەسالاری - تا چیتر بە هۆی- وێنا قەدەرییەکانمانەوە - واقمان وڕ نەمێنێ بە دیار پێودانگەکانی ئەقڵ و مەعریفەوە. لەم بوارەشدا لایەنی کەم پێویستیمان بە «ئەڵقە و زنجیرە یەک بەدوایەکەکانی چاودێریکردن هەیە کە بتوانێ جووڵەکانی ئەقڵ و دەروون و ئیشکردنی میتۆد و گوتارەکانمان بۆ بخوێنێتەوە و گومانیش بە ئیرادە ڕاستەقینەکەیەوە.. ئازادانە هێزەکانی خۆی بنوێنێ و کار و هەڵسەنگاندنەکانی کارسازانە ئەنجام بدات» بەختیار عەلی لە «ڕۆشنبیری تاک ڕەهەنددا» بەشێوەیەکی سیستماتیکانە لە ئاستە جیاجیاکانی سکێچی ئەو پرۆسێسە دواوە. تا چی تر لە نێوان چەکوش و سندانی «قارەمانێتی و قوربانیدا» هێندەی تر ون و ورد و سەنگەسار نەبین؛ بۆ ئەوەی بتوانین پرسیار و ڕیسک و گەشتە گوماناوییەکانمان بە نێو گشت دوورییە ناسراو و نەناسراوەکانی بوونماندا بکەین، دەشێ شادەستوورێکی ئەقلانی فرە ڕەهەندی وەها بەرقەرار بکەین، کە (ئاکارنامەی هۆشیش) لە گشت پرۆسێسەکاندا ببێتە ڕێنوێیکەری «نسبیەتی» وردە دەستوورەکانی تر، بێ ئەوەی ماف و سروشتی تایبەتیەت و سەمەرەی سەربەخۆییانەی هیچ کایەیەکی تر مەحف بکاتەوە. چونکە «ئەقڵ بەشێکە لە بەشە



جۆراوجۆرەکانی کیانی مرۆڤ، دڵ هەیە کە ئەقڵی دووەمە... من ئەو کەسەم خۆش دەوێ کە سەری ناوئاخنی دڵێتی -نیچە-» ئەو ئاماژانەی سەرەوە لە خۆیاندا چاو ساغیمان دەکەن بۆ سەرلەنوێ پێناسەکردنەوەی ئەو شتانەی بە ئەقڵ ڕوونییەوە پێناس نەکراون و بە غەیبییانە و تاکڕەهەندانە لە لایەن فەندەمانتاڵیستەکانەوە لە قاڵبی ئایدۆلۆژی دراون. وە کۆمەکیشە بۆ نەگەڕانەوە بۆ وەهمە بابردەڵەکانی ڕابردوو، خۆ فریونەدانیش بە دڵنیایی و خولیا دوورە دەستەکانی داهاتوو، بەڵکە ناسینی ئەو مەسافەیەی نێوانیان کە دەکاتە هەنووکەیی - ئەمێستا- کە بە (هیچ).. (بێمانایی).. (بۆشایی) (مەحاڵ).. (نەبوون) ناوم بردوون. وێ دەچێ ئەگەری ئازادییە فرە ڕەهەند و فرە ئاسۆ و فرە مەودا و ڕەنگاڵەییەکانیش هەر لە هەناوی ئەو - استثناء-انەی ناو ئێستادا بن و ئەو ئێستایەی جێیەکە لە نێوان جەمبوونەوە و جیابوونەوەی مێژوو و یۆتۆپیادا! ئەو بۆشاییەی ئەگەر بهێنرێتە گۆ، سەرزەمینی پرۆژە نەناسراوەکان دەبێت بۆ ناسین و ئیشکردن ؛ کە ئەمەش سەرمایەیەکی ڕەمزی و ئەڵتەرناتیڤێکە.

* داخوا ئێمە ئەو ئامادەگییە دەروونی و مێژوویی و بنیاتی و ئەقڵییەمان لە خۆماندا نیشان داوە و هەیە کە توانای دەستەبەرکردنی تێشووی ئەو سەفەرە بێ وێستگانەمان بۆ فەراهەم و خۆشدەست بکات!؟بۆ خاتری ئەوەی خۆم ڕەقیبی قەباعەتە نائەقلانییەکانی خۆم بم چاکترە لێپرسراوانە هەڵوێستە بکەم، لەبەردەم پرسیارگەلێکدا کە ئەمانەیە:

١- دەشێ لەدووی چ پێودانگەلێک هەڵوەدا بین، بۆ هەڵسەنگاندنی هەنگاو و ڕوئیا و جێگە و ڕێگەی خودێکی بێ شووناس؟

٢- ئەو مەرجانە چین کە دەبێ پارێزگارییان لێ بکرێت و چاک بکرێن و گەشەیان پێ بدرێت، دەرهەق بەو شتانەی بەرهەم هاتوون و بەرهەم دەهێنرێن لە گشت کایە جیاجیاکاندا؟

٣- چ پرۆژەیەک پێویستە، بۆ بیرکردنەوە لەسەر ئەو بیرکردنەوانەی دەبنە دوا نەخشە و سنووری هاتوچۆی ئازادانەی ڕیسکەکان؟....

بە بۆچوونی من گەر لە سەرەتادا، توانایی ئەوەم تیا هەبێت لە چاوی

دوژمنەکانمەوە لە خۆم بڕوانم و ڕابمێنم، دوژمنانە لەگەڵ لاوازییەکانمدا بجەنگم و لە گەڵیاندا نەچمە هیچ ڕێکەوتن و کۆنتراکتێکەوە... وە بە عیشقی هەڵۆی مینەرڤا لەسەر هێلکەکانی خۆم هەڵنیشم؛ بە ترووکاندنیان شوناسی تازە وەردەگرم، شوناسی منی «من» و شوناسی منی «نەتەوە» و شوناسی منی «ئینسان»!!

ڕۆشنە؛ «دۆستان بەختەوەری لەسەر ئەم ڕووی زەمینە بە موبارەزە سەقامگیر دەبێ- نیچە-» ئەو بەختەوەرییەی وەکو ژیان ناسەقامگیرە و هەرجارە و شێوەیەکی هەیە. دەی چەندێک دەتوانم شێوەکانی بناسم؟! ئەو شێوانە وەچەکانی بەختەوەرین. هەر ئەمەشە شوناسی تر دەبەخشێ بە سەفەرەکانم...! تۆ دەڵێی چی...؟

هەفتەنامەی جەماوەر ژمارە ٢١٢

# ئێوە بیر ناکەنەوە، کەواتە من هەم!

ئەی کۆیلە پەخمە و ڕەنگاوڕەنگەکانم؛ بێ مەلامەت نییە لە دەرەوەی ڕۆحیانەتی مندا (سەدام حوسەین) هەست بە بوونی ڕاستەقینەی خۆتان ناکەن... ئەم ڕاستییەشتان دەرک نەکرد؛ هەتا بە دەستی خۆتان هەمان مێژووی منتان لەسەر جەستەی پیرۆزی خۆم دووبارە نەکردەوە. بنۆڕن کە هەڵتاواسیم زۆرتان نیگەران بوون هەر لە پاکستان و.. هیندستان و.. عەرەبستانەکان و.. ستانەکانی تریش نەک لەبەر ئەوپەڕی فرە مرۆڤبوونتان، یاخود وەفاداربوونتان بەقووڵی فەرمایشتەکەی مەسیح کە بۆ جەللادەکانی دەپاڕایەوە و دەیگوت: (خودایا بیانبەخشە چونکە ئەوان نازانن چی دەکەن). یاخود هەندێ ڕیاکاری سیاسی وەها کە نەترن دەنگیان هەبێت؛ نە تسن بۆنیان هەبێت دژ بە لە سێدارەدانی من بوون، کەچی جگە لە خۆیان هیچ گرۆپێکی تر و جیهانبینییەکی تر و سەرکردەیەکی تریان قبووڵ نییە. ئەگەر بە ڕاستی ئەو ڕیاکارانە ئاوهایی بان لەدڵەوە هەستم بە شکستی ئەزموونی سی و پێنج ساڵەی دنیابینییەک دەکرد کە نوقڵانەی بە مێگەلبوونی گەلەکەمی نیشان دام. بەڵێ ئێوە کە لە شەڕی مندابوون لەبەرئەوە نەبوو جیا لەوەی من بیرم لێ دەکردەوە، ئێوە بیرتان لێ کردبێتەوە. بەڵکو ئێرەیی بردنتان بوو بە فەرمانڕەوایەتییەک کە تەنها پێم وابوو ڕەهبەریەتەکەی بە خۆم دەکرێ و بەس! ئەگەر قسەکانم بە بوختان و غەڕابوون تێدەگەن با هەر گرووپە و لە شوانەکەی؛ – ببوورن– سەرکردەکەی خۆی بڕوانێت. ئەوەتانێ بە چەندین شێوەی جیاجیا، لەوان من دادەتاشنەوە. شاراوە نییە کە ئێوەم بە هەزار و یەک تاقیکردنەوەی تاڵ و تفت و فریودەردا برد، هەتاوەکو بە خۆم و ئێوەش بسەلمێنم کە بێ تەوتەم ناژین و تا هەنووکەش ناتانکرێ. بەڵێ شەڕی ئێوە بۆ کوشتنی باوکەکان نەبووە و نییە بە یەکجاری.. نا بە شیرینی کۆیلەتیان قەستەم تەنها مومارەسەی گرێی گزگلییەکانتان دەکەن لە تابوورەکاندا)، هەریەکە و بەپێی پێکهاتەی دەروون و بنیاتی بنکۆڵی خانەوادەیی و حیزبی و دینی و



ئایدۆلۆژییەتی خۆی. تووڕە مەبن لە من، تووڕەبوونێک کە لێتان نایەت. بەڵکو تووڕە بن لە فریودان و کاڵفامی خۆتان.. کە باوکێکی تر بۆ خۆتان ئافەریدە دەکەنەوە. هەتاوەکو بە هەتیوی ڕووبەڕووی ئینسانییەتە زەوتکراوەکەی خۆتان نەبنەوە و پاڵ بدەن بە قەڵایەکی وەهمەیەوە کە لە کاتی تەنگانە وجودی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و.... تاد کاندا پارێزگاریتان لێ بکات.

ئێوە.. ئەی (گەلە)کەم لەوەتی دەتانبینم هێزێکتان لە خۆتاندا هەڵنەقۆزیوە. تەنها ئەو کاتانە نەبێت کە بەردراونەتە گیانی یەکتر و پرۆژەکانی یەکتر و ئامانج و خەونەکانی یەکتر...! هەندێک دەنگی شەرمنۆکی فامیدەم دیتووە، یا بیستووە، لێ ئەوانیش نەیانتوانیوە هەتا سەر بیرکردنەوەیەکی جیا لە زایەڵەکانی منیان هەبێت. چونکە دەڵێن فیل هەر لە منالییەوە گوریسێک لە قاچی دەبەستن و کۆتی دەکەن بە مێخێکەوە، کە گەورەش دەبێت هەر بە هەمان گوریس دەیبەستنەوە کەچی توانا و ئیرادەی یاخیبوونی نییە بۆ هەڵکەندنی مێخەکەی، لە کاتێکدا هێزی زۆر زیاترە لەوەی ئەو مێخەی پێ هەڵنەکەنرێ، لێ چونکە لە منالییەوە تەڵقین دراوە)، کە لەگەڵ دیلێتییەکەیدا گەورە ببێت، هێزی دیلێتییەکەی لە هێزی بەدەنییەکەی زۆر بە هێزتر دەبێ! هەربۆیە فامیدەکانیشتان لە ناو هەموو زمانەکانی تریاندا کە هەیانە، لە دواجاردا تەنها یەک زمانیان بۆ دەمێنێتەوە کە چۆن کۆیلەیەتی خۆیانی پێ بڕازێننەوە و چەپڵەلێدەران بۆ خۆیان یاخود کوێخاکانیان خڕبکەنەوە. کوان ئەو فامیدانەی لەزەت لە شکستی بەرامبەرەکەیان نابینن؟ یاخود لە بەردەم لێپرسراوێکی سیاسیدا دەست بە شەهامەتی ئەزموونە تاقانەکانی خۆیانەوە بگرن و پێی بڵێن برای دیلم پاشامان قنگی ڕووتە؛ نەک جلی ئەفسانەیی لەبەردابێ..! ئەگەر چەند فامیدەیەکیش لە گۆڕێدا هەبن بە دەردی برا گەورەکەی (حەسار و سەگەکانی باوکم) ی شێرزاد حەسەنی پێ دەکەن کە تەنێ بە (مەزنە و بەس) بە خەیاڵیدا هاتبوو ئەو باوکە نەخۆش و سادییەی بکوژێ، کە مایەی خەساندنی هەموو خوشک و برا و زیندەوەرەکانی ناو حەسارەکە بوو؛ هەتاوەکو هۆشیارانە کۆیلەتییان ببەزێنن و بچنە نێو مەرزە بێمەرزەکانی ئازادییەوە؛ کەچی گرتتان و بە دەستی خۆتان سزاتان دا و پێتان گوت: (بۆ باوکە ئەگیدەکەمانت کوشت ئێمە بە یاساکانی ئەو گۆش ببووین و

ڕاهاتبووین). ئێوه قالۆنچەن، چونکە قالۆنچە بۆنی شتی خۆش بکات دەتۆپێ. هەر ئەوەش بوو گشت بۆنە خۆشەکانم بە درێژی ژیانتان لێ گرتبوونەوە. ئا.. باوک فرزەندی خۆی چاک دەناسێ، بۆیە لەسەر ئەو وێنانە لە قالّبی دەدات کە پێی وایە بۆ ئەو باشن. کێیە دەڵێ من باوکێکی باش نەبووم؟! ئەی ئەوە نییە ئازادی دەگۆڕنەوە بە دنیاکەی جاری جارانی من. هەمووتان، بێ جیاوازی هێندەی پێتان بکرێ بە قەڵەم.. چەک.. گەندەڵی.. تاد زمانی یەکدی دەبڕنەوە بۆ خاتری بەر قەراربوونی یەک زمان و بەس؟ سادەترین وێنە ئەوە نییە وەزارەتی پەروەردەکانتان دار لەسەر سەری قوتابیان هەڵناگرن.. ئەی ئەوە نییە هاوسەرەکان بەدگومانن لە بەرامبەر هەست و نەستی یەکدی و شەرحی مار بەدار زمانحاڵیانە؟ ئەی ئەوە نییە من دارخورمام دەبڕییەوە هەنووکە ئێوە هەزارەها سەگی دڕ و گوێدرێژی بێ مەئوای لادێ ئاوەداننەکراوەکان ئەتک دەکەن، بەخێرێ بۆ خاتری بەرژەوەندی گشتی شار؟ ئەی ئەوە نییە فەرمانبەران و کرێکاران بێ ئەوەی بخوازن ئەندامی حیزب بن ئابوونە لە مانگانەکانیشیان دەبڕن؟ چیدی بێژم باسی وێنەی سەرکردەکانتان بۆ بکەم.. خۆ سووتانەکانتان بۆ دیلبوونیان؟ لە خۆوە قسە ناکەم کە دەڵێم شوکر وەجاخم کوێر نەبۆتەوە. لەهەر یەکێکتاندا وێنەی خۆم دەبینم.. خودای من، سی و پێنج ساڵ ڕەنجێکی بێ عەفوام نەدا. بنۆڕە خودای من (سەر عەوام و بن عەوام) ئیدی بە دەستی فرزەندە شیرەخۆرەکانی خۆشم بشمرم چ نییە...

- (ئەشهەد و ئەننە لا ئیلاهە ئیلا ڵڵا.. ئەشهەد و ئەننە موحەممەدەن ڕەسوڵە ڵڵا)!

+ (عاش سەدر.. عاش سەدر)!!

سەڵاوات..... سەڵاوات

هەفتەنامەی جەماوەر ژمارە ٢١٣

## لەمپەرەکانی خود

لەمپەرەکانی خود؛ پێش هەر شتێک خود خۆیەتی. ئەگەر (بۆ بەرجەستەکردنی تواناکانی خود) سیمایەک شک نەبات بۆ شکڵ پێدان بە خۆی لە نێو سیماکانی تردا. دەنگێک شک نەبات بۆ هەڵچنینی ئاوازەکانی خۆی لە پاڵ ئاوازەکانی تردا. ڕێگەیەک شک نەبات بۆ هاموشۆکانی خۆی لە پاڵ ڕێگەکانی تردا!

خودێکی بێ سیما و خودێکی بێدەنگ و خودێکی بێ ڕێگە دەبێ چی بێت...، جگە لە سەدا و دەنگدانەوە و سێبەرەکانی دەرەوەی خۆی زیاتر؟!

گەرچی خود لە هیچی ڕووتەوە، نەهاتۆتە بوون و نایەتە بوون، بەڵکو ئەوە قیبلەنومای خودە زەمانەتی دەکات لە نرخاندنی ئەو چاکە و خراپەیەی لە دابونەریت و بایەخەکانی هەمووان دەرژێت، دیسان چاکە و خراپەیەکی بژارکراو کە (شیاوی بیرلێکردنەوەیە).. هەڵدەسەنگێنێ و مانای تری دەداتێ و گەوهەری شوناسی خۆی پێ دروست و لێورێژ دەکات.

گەڕان و سۆراغکردنی خود، هەرگیز ڕەتکردنەوە و وەلانانی ئەوانی تر ناگەیێنێت. بەڵکو لە ڕۆیشتن و هەڵوەدابوونێکی ئێتیکییانەدایە (هەوڵ دەدات پێوانە خۆییەکان لەگەڵ ڕووداوەکانی دەرەوەدا بگونجێنێت) تا بە ناو ئەوانی تردا دڵاوایییانە و دۆستخوازانە هەنگاوە ڕاستەقینەکانی دەست پێ دەکات، چەشنی ئەو هەنگەی بە نێو باخە جۆرا و جۆرەکاندا بە ئارەزووی خۆی گەشت دەکات و بە هەنگوینی خۆیەوە دەگەڕێتەوە، کە بەشی ئەوانی دی و خۆیشی دەکات.

بەڵام ئەم خود خوڵقاندن و دروستکردنە چەندێک بەفەڕە و بە بەرەکەتە...، هێندەش بێ فەڕ و زڕە ئەگەر بە ئاگا نەبێت لە داو و فشارەکانی دەوروبەرێکی یەکڕەنگ و داخراو. بەو مانایەی فرە ڕەنگی دەوروبەرمان نەناسی و نەمانکردە دەستێکی کۆمەککار بۆ ئاشناکردنی کردە و خەسڵەتە نائاشناکانی خۆم بۆ خۆم و



لە سیفەتەکانی خۆم نەچم. ئەوا خودی خۆمم بۆ سیفەت و گەمەکانی ئەوانی تر ئافەریدە و داگیر کردووە، کە ئەمە سیمایەکی دیاری وڵاتە دیکتاتۆرەکانە.

ئەگەر ناوکۆکەی خود لە ڕوانگە و ئەزموون و چاودێریکردنی سنووربەندییەکانی پرۆسەی گەشەکردنی خۆیەوە نەبێت و هەموو جووڵەیەکی تەنها و تەنها لەوانی ترەوە دەست پێ بکات و بۆ پێناسەکانی ئەوان بگەڕێتەوە، ئەوا ئەوان ناوەند دەبن بۆ خود و خودیش لە توانا و کردەوە سەرفیراز و ڕاستەقینەکانی خۆی دەپچڕێت و پەڕاوێز دەبێت بۆ پیادەکردنی تەراتێنی تواناکانی ئەوانی دی.

بەهای کاریگەرییەکان لەسەر خود ئەو کاتە پۆزەتیڤ دەبێ، کە بە هەڵبژاردن و بۆ پەرەسەندنی هەڵبژاردنەکان بێت و بۆ ڕاگرتنی پایەکانی کۆڵنەدان و وەرچەرخاندنە سەنگینەکانی خود بێت. ئەگەر نا بەپێچەوانەوە دەبێتە مایەی بزرکردنی جێگە و ڕێگەی ئازادییەکانی خود لە نێو شتگەلێکدا کە دەیکاتە، گوێڕایەڵ و وەسیلەیەک بۆ یاسای بێڕۆحی شتەکان و پێودانگەکانی ئەوانی تر.

خودێکی بوێر؛ لە سەرەوە چوون و قووڵایی چوون و ئافەریدەکانی جودا ناکرێتەوە و بە کۆشش و هەڵبژاردنە پڕ هێوریی و پڕ مەغزاکانییەوە دەناسرێ و چییەتییەک کە- ویستەڕێیە- دەدا بە ئاگایی و هەستەکانی خۆی.. تا ناوەوەی خۆی ڕێک بخات و قایل بکات. چونکە پێی وایە (مرۆڤ تەنها ئەو کاتە بەشێوەیەکی ڕاستی مۆڕاڵی دەژی، کە بتوانێت لە هەموو جۆرە فریوێکی دەرەکی تەواو سەربەست بێت- ئانپیستێنیس- قوتابی سۆکرات) کە جیایە لە بۆماوەیی چییەتییە نەگۆڕ و هاوڕەنگەکانی عەوام کە گوزارشتەکانی نمایندەی ویستی خۆی نییە و ڕەفتاری چۆکپێدادراوی و پرتەپرتی گوفتاری، بە ناچاری درکێنەری ویستی واعیز و فەرماندەرەکانێتی و بەس!

ڕاستە کە ئێمە فڕێ دەدرێینە ناو بوون، کۆمەڵێ هەلومەرج و یاسای گشتی بە ڕووماندا دەتەقێتەوە و ئابڵووقەمان دەدا و سیستەمگەلێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەوری داوین.

وەلێ (بوون لەگەڵ کەسانی تردا، بنیاتێکە لەناو بوونی خود خۆیدا، چونکە هیچ خودێکی تەریک لە خودگەلێکی تر بوونی نییە. بەڵام تاکەکان لە نێو ئەم سیستەمە

کۆمەڵایەتییانەدا سیستەمگەلێکی تازە و بنیاتگەلێکی هەمەچەشن کە بە پێر پێویستییە تاکە کەسییەکانەوە بێت دادەمەزرێن- هایدگەر-) لە دواجاردا خۆداری لە نێو دژوارییەکاندا دەتوانێ دڵدانەوەیەکیش بێت، یا دڵنەواییەکە مرۆڤ بۆ نارازیبوونە جەربەزەکانی خۆی دایهێناوە! گەر وا نەبایە چۆن درک و گوڵی شەو و ڕۆژ، لەگەڵ لێکنەچوونیشیان ئاوها لە هەناویدا ئاوێزانی یەکدی دەبوون..؟

هەفتەنامەی جەماوەر ژمارە ٢١٨

## خود.. تا چی تر لەبار نەچێت!

دەشێ تا ئەو ساتەوەختە پشتیوانیکەر و لە خەمی ڕزگاربوونی خوددا بین، کە خود ئاگاییەکی شک نەبردووە تا پارێزگاری لە چییەتی و شوناسە ڕماو و گلاوەکەی پێ بکات. هەر گرووپێکی موبارەک و ناموبارەک هاتووە، بووە بە مێردەزمەی سەری و زمانەکەی کە دەکاتە قەوارەی بوونی؛ لێی سەندۆتەوە و لە بری ئەوە ترپەترپ و پرتەپرتی وەعز و فەرمایشتەکانی خۆی ئاخنیوەتە نێو زارو دەمی.

لەو دەمەدایە دەبێ ببینە هاوهێزی خودێکی داگیرکراو و بێ دەر و دەروازە، کە نیازێتی لە هەڵکەوتەکاندا بە چنگە کرێش بێت، بۆ گەشانەوەی ئارەزووەکانی ئاوەڵابێ و لە نووچدان و تەڵەزگەکانی بێتە دەرێ و چاکتر و زیندووتر بێت لەوەی هەیە. ئەوجا جێ بهێڵرێ بۆ کوێندەر چوونەکانی خۆی، سەرهەڵدانەکانی تری خۆی، زمانگرتنەکانی خۆی، دواتریش بێ شەرم و شکۆ پێی بوترێ: (گەر دەتەوێ هاوڕێم بیت خۆت بە- نیچە-)

چونکە دۆشدامان بە دیار خودێکەوە، کە پاڵی لێ دەداتەوە و چاو لە دووی نوێبوونەوەی بایەخ و بەهاکانی نییە و دووری تریان پێ نابەخشێ بۆ هەڵسووڕان، تەنها چاوەڕێی کۆمەکی پزیشک و جەربەزەییەکانی ئەم و ئەوە، دەرئەنجام گۆڕهەڵکەنی خەونەکانێتی و بەربوونەوەیەتی بۆ فەوتبوونێکی تر بە دەستی ناپوختییەکانی خۆی.

ئەو خودە یەخسیربووەی توانای سەرووچوونی فریاگوزارییەکانی خۆی نییە، هەتا لە ئاستێکەوە بچێتە ئاستێکی تر، پشتی تێ نەکەین پشتمان تێ دەکات.. چونکە هەر ئەوە، بەر لە هەرکەس پشتی لە زەمینی خۆی کردووە!

ئەو خودەی خۆی نەگرێتە ئەستۆی دیقەت و خوردبوونەکانی خۆی، نە توانای خۆ بەتاڵکردنەوەی هەیە لە شکستی و لاوازییەکان؛ نە هیچ گەشە و جوامێرییەکیش دەرژێنە ناوییەوە!





ئەو ڕەزمەشی دەیخاتە سەر کەڵکەڵەی سەما بۆ ژیان خپ و کپ و نووزەبڕاو و بێ نموود بووە!

خود تا ئەو ساتەوەختە دەبێ ئامانج بێت.. کە نەبۆتە ئامانج. ئەگەر نا دەبێتە کەڵەگا.. مشەخۆر.. تەوتەم.. دیکتاتۆر!

هەرکاتێ لە ساغ و سەلامەتی خود دڵنیا بووین، دەبێ ببێتە ئامرازێک بەدەست هەڵگیرسانی نەبەردییەکانی خۆیەوە و سۆراغکردنی سەرفیرازییەکانی لەدەست تێهەڵچوون و پڕکێشییەکانی خۆیدابێ، نەک هانای کەسێکی تر و لەسەر تاڵانکردنی دادی کەسێکی تر.

ئەوە نەبەردییەکانی ئەوی سەرفیرازە، سەری ئەو چڵ و چێوانەی کە چیتر چرۆ و گوڵ و بەر ناگرن دەقرتێنێ! مینا ئەو شاعیرە و نووسەرە دڵناسک و بێ گوناهانەی لە پێناو سەربڵندی و شان و شکۆی ڕوئیای وشەگەلێکی ژیان تێزاودا... سەدان وشەی تر دەگلێنێ و بەسەر لاشەی وشە بڕستبڕاو و شکستخواردووەکاندا هەنگاو هەڵدەگرێت تا گەیشتن بە سەقامگیری ئەو شانشینەی کە شیاوی ئەندێشەکەیەتی. کە وەچەیەکی ترێتی لە ئاگری ئەقڵی و ئاوی زوڵاڵی ڕۆحی!

خود بۆ ئەوەی لە کەوڵی بۆگەنکردووی خۆیدا بزر و وێران نەبێت و لەگەڵ لەدایکبوونیدا نەمرێ، دەبێ جورئەت و هێزی ئەوەی هەبێت دەسکەوتە گومڕاکەرەکانی جێ بهێڵێت و لە شوێنکاتێکی تردا بە گەنجینە و ئازووخەی تری ئاگایی و ئەزموونەوە بگەڕێتەوە بۆ لای ئەوەی جێی هێشتووە، تا خاشاکەکانی لێ دەرهاوێ و تۆوێکی تر بە کێڵگەی گیانیدا بپرژێنێ، کە نەیدیوە و تاقی نەکردۆتەوە و لەگەڵیدا نەژیاوە، گەر وەها نەکات بە گەرداوی دووبارەبوونەوەکانیدا دائەچێ.

ئەوە وزە و هەڵچوونەکانێتی، زۆرانبازی و قامچی بڵندبوونەوەکانی هزر و دەروونە خاراو و پاراوەکەیەتی دەخوازێ بەردەوامی هەڵکشانی پێ ببەخشێت و بەرزی بکاتەوە بۆ بەرزتر لە دوێنێی خۆی. ئەو کاژانە لە ڕۆح و بیرکردنەوەی دابماڵێ کە بێبەری دەکەن لە ناوئاخنە ئینسانییەکەی خود و لێناگەڕێ پێوەرەکانی خودپەرست و لە هەمان کاتدا قەڕاڵ بێت بەسەر ئەوانی ترەوە.

***

ئەگەر چی لەو کۆمەڵگەیانەی جێگە و ڕێگەی؛ ماف و بەرپرسیارێتی و ئازادی تاک و گرووپ وتوێژ و چینەکان، ئەقڵانیانە ڕێکنەخراون، هەڕەمەکییانە بە نێو یەکدیدا چوون و ئایدۆلۆژییەتی هەر دەستەیە دەخوازێ لەسەر ملکەچ کردن و سڕینەوەی ئەوی تر خۆی سەقامگیر و هەمەکار بکات، لەو فەزا ناتەندروست و تێکە و لێکەدا هەمیشە و زۆربەی کات لە بری کامڵبوون، تاکەکان بە لای ملهوڕی و تاکڕەوی دەسەڵاتخوازیدا ساغ دەبنەوە. لەو کۆمەڵگە نەخۆشانەدا ئەستەمە پلە بەرزبوونەوەکان لەهەر بوارێکدا بێت، گەراکانی مشەخۆری و شەڕەئەنگێزی و دەمارگیری و خۆ بە گەورەزانین و لە خۆباییبوون و چاوچنۆکی و بەرچاوتەنگی، لە دەروونی کرمەڕێز و بە زەلکاو بووی کاربەدەستانیدا نەترووکێنێ. کە پڕن لە ڕق و تۆڵە و بوغزی، گرێکوێرەی شکستە دەروونی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و پەروەردەییەکان!

بۆیە بۆ سەرەڕێ چوونەوەی هەناوی ئەو کێشانە بە توێکاری و توێژینەوە و خوێندنەوەیەکی قووڵ و هەمەلایەنەی (ئەو ڕەگەزە فەرهەنگی و ئیرادەییانە دەبێت، کە گوزارشت بێت لە کۆی وێناکردنی زەینییەتەکانی هەموو کۆمەڵگە بۆ خۆی. کە هارمۆنیکییەت و تەبایی و گونجاندنی گشت یەکە و پێکهاتەکانی پابەند دەکات بە پێداویستییەکانی یەکترەوە- بەندێکت ئەندرسن-) ئەوجا دەسەڵات شتێک نابێت، جگە لە پلۆڕاڵیەت و کۆی ئەو وردە دەسەڵاتانەی کە خانە و شانە و ئەندام و کۆئەندامی جەستەی کۆمەڵگە دادەڕێژن. لە (ڕێگەی خوێندن و فێربوون و ئەدەب و هونەر و زمانی پسپۆری و زانکۆکان و فەرهەنگی سیاسی و بەڕێوەبردن و چاپی کتێب و ڕۆژنامە و تەلەفزیۆن، کە دەبنە فەرهەنگی هاوئاهەنگ و جووت لەگەڵ پێداویستی نەتەوەی خاوەن سەروەری و سەربەخۆیی) کە بە داخەوە لە کۆمەڵی ئیفلیجبووی ئێمەدا ئەم ڕێگەچارەیە لە پلەی سفردایە و تەنها و تەنها ئایدۆلۆژیا و حیزبسالاری ئێسقانی یەکە و گرووپ و پێکهاتە جیاوازەکانی سمیوە و هەوڵی خۆڕسکییانە و بە دیسپلینی وردە دەسەڵاتەکانی دەرەوەی خۆی بە دەیان تەونی بینراو و نەبینراو خزاندۆتە قەفەزی ئاسنینی خۆیەوە و بەم کارانە و خۆ جوانکردن و ڕازاندنەوەی بە ڕووپۆشبەندییەکانی مۆدێرنە کە فێڵێکە، بەر لە هەرکەس لە خۆی



دەکات. چونکە وردە پڕۆژە و وردە فەرهەنگ و وردە ئیرادە و وردە ڕوئیاکانی بە قەڵەمڕەوییەکانی خۆیەوە، بەرەو نابووتبوونێکی چاوەڕوانکراو بردووە و دەبات. ئەم کولتوورە سیاسییەش، کە ئامادە نییە چاودێری بکرێ و خۆیشی چاودێری خۆی ناکات، دەکاتە دیلکردن و مردنی خودی تاکەکان لە نێو هەژمونگەری خێزان و مەنگەنەکانی قوتابخانە و تەڵقینەکانی مزگەوت و پرەنسیپەکانی حیزب و مەرجداری دامەزراوە داخراوەکانی تردا، کە بێ جیاوازی ڕاست و چەپ و میانڕەو و ڕۆشنبیرانیش لێی بەرپرسیارن.

هەنووکە؛ لایەنی کەم لە کوردستاندا دروشمی (ئۆخەی ئۆخەی هەرکەس بۆ خۆی) دەرئەنجامی ئەو هەرەسە کولتوورییەیە، کە ناوێرین چاو لە چاوی ببڕین و هەر جارەی بەهانەیەکی بۆ دادەتاشین. چونکە جورئەتی ڕووبەڕووبوونەوەی لاوازییەکانی خۆمانمان نییە!! هاوارەکانی لێرە و لەوێش بەر دیواری ئەستووری دەسەڵاتە پینەکراو و پڕ قەیراناوییەکان دەکەون و بێ بیستن و هەستیارییەکی جیدی دەکەونە خوارێ، بۆ بەر پێیان. وەک چۆن جاری جاران هاواری دەسەڵاتدارە خەمساردەکانی ئەمڕۆ...، بێ مووچرکە پیاهاتن بە ویژدانیاندا دەکەوتنە ژێر پێی دەسەڵاتدارە گومڕابووە لووتبەرزەکانی پێشوو.

(هەموو خۆمان بۆ کوشتنی ئەژدیها ئامادە کردووە و دەکەین بەڵام دواجار بە هۆی ئەو مێروولە بچووکانەی، هەرگیز گرنگیمان پێ نەداون هەپروون بە هەپروون دەبین- پاولۆ کۆیلۆ-)

گەر ئەو هێما ئاشکرایانە، نابینا بگرین و لە پرۆسەی ئەم ڕەوتە و ئاڵۆزییەکانی لێپرسراوانە ڕانەمێنین، واتە هێشتا تۆوی بارودۆخی، سیستەمی پێشوو بە ئەمانەتەوە لە خۆدا هەڵگرتووە و دەپارێزین، بەم کارە دووبارەبووەشمان، پێ دەچێ ئەویش- مێژوو- جارێکی تر، لێ بەشێوەیەکی تر و لە بەرگێکی تردا، ئاژاوەیەک کە هەموو بە کاڵفامییەکانمان تەگبیر و فاکتەکانی فۆرمۆلە و گۆش و دروستی دەکەین بەرجەستانە خۆی دووبارە بکاتەوە.

تۆ دەڵێی چی...؟!

هەفتەنامەی ئاوێنە ژمارە ٦١

## خود و.. ماسکەکانی!

لەبەرئەوەی لە کۆمەڵی ئێمەدا خود، یەکەمین بکوژی خۆی بووە.. بۆیە هیچ چرکەساتێک خوڵقێنەری خۆی نەبووە.

پرسی (چۆن کەسێک دەبێتە شتێک کە هەیە- نیچە-) ئاوڕی ئەقڵانییانەی قووڵ و فرەوانی لێ نەدراوەتەوە و برەودار نەبووە. لای مایکڵ تێنەر (مرۆڤ لە ڕێگەی نەبوونی بە کەسێکی تر دەبێتە شتێک کە هەیە) بۆیە جێی سەرسوڕمان نییە مرۆڤی ئێمە بۆ پاراستنی جەستە و بوونی سروشتییانەی خۆی، ناچار لە پشت کۆلێکتیڤیزمێکەوە- کۆگەل- خۆی حەشاردابێت و وەستابێت یا لە نێویدا توابێتەوە. ئەمەش بە مانای دەستبەردار بوون و لە دەستدانی گەوهەری ئینسانییانەی خۆی بووە. هەربۆیە بە درێژایی مێژووی بێ بنیاتی خۆی، ماسکەکانی ناسیۆنالیزم و کۆمۆنیزم و مەزهەب لەسەر سەری شکۆ dignity بێ شوناسەکەی هەبوون و داناوە.

- یست و یزمەکان- زەمینێکی بە پیت نەبوون بۆ دەرکەوتنی هێزە شاراوەکانی خود و ئاشکرابوونی تواناییەکانیان، بەڵکە تەنها ئەزموونی شکستەکانی خۆی تیا کردووە. لە بێ باڵەفڕکێی بیرکردنەوەکان.. لەژێر بەستەڵەکی بیروباوەڕەکاندا باڵەتەپەی بووە و بە ماسکەکانی ئەوان خۆی پیشان داوە و کەوتۆتە جووڵە و ئاخافتن. بۆ ئەوەی پێی نەوترێ خودپەرست بووە بە دوگماپەرست. ئەم خودە دەمامکدارەش بە دوو دەرئەنجامگیرییەوە هاتۆتە دەرەوە:

شەرمن لە پێشدەم پلەکانی سەر و خۆیدا و مەرجەعەکەی، بێ شەرمیش بۆ سەپاندنی پەیامەکەی. چونکە یزمەکان زیندانێکن بە ئاسانی لەسەر گرژییە ئۆنتۆلۆژی و کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی لایەنگر و بانگەشەکەرەکانی دەلەوەڕێ و دەیانوروژێنێ بۆ خۆی و بە خاتری خۆی- واتە- نەک مێشک سافی و خاوکردنەوەی دەمارگرژییەکان بۆ لایەنگرەکانی دەستەبەر بکات. بەڵکو وەها باریان دەهێنێت تاسەر ئێسقان تواوە بن بۆ مەرجەعەکەیان، کە بیروباوەڕێکە.. ئیمانێکە..



حیزبێکە.. میتۆدەکەیەتی!

بەپێچەوانەکەشی تا سەر ئێسقان ڕەق و توند، بەدنیاز.. بەدخوو.. بەدرەفتار و بەدبین لەگەڵ دەرەوە گومانهێنەرەکەدا.

ئەم دووڕووییەش (double-faced) خود بەرەو پارچە پارچە بوون دەبات. بەڵێ بێ قەید و شەرت ستایش بۆ مەرجەع و بێ پایانیش لۆمە و سەرزەنشت و دژایەتی بۆ دەرەوەی مەرجەع و ئینجا خۆشی بینین و دڵ ڕەحەتبوون بە شکستەکانی بەرامبەر. بە مانای موتوربەکردن و بەربەرەڵاکردن بۆ پێڕەوکردنی ئەو شەڕەنگێزییە لەسەر حەرەمی دوژمنە وەهمی و حەقیقییەکانی.

کورت و پوخت ئەمە یاریکردن و بەتاڵکردنەوەی خودە لە ناسنامەکەی (self- identity).

لە بری ئەوەی خود لە نێو ئەزموونەکانیدا بە دوای خودی خۆیدا بگەڕێ و لە کۆمەڵێ دووری جیاجیاوە، دایەلۆگی لەگەڵدا سازبکات. دێت و فەرهەنگی مەرجەعەکەی هەڵدەداتەوە و لەوێدا بۆ جێگە و ڕێگەی سەنگینییەکانی خۆی دەگەڕێ. وە پاڵپشتی مەرجەعەکەیشی بڕێنەرەوەیە و بە یەکەم سەرچاوە و بگرە دوا سەرچاوەشی دەبینێت و دەزانێت- واتە- لە کەسێکی بیرکەرەوە دەگۆڕێت بۆ کەسێکی خاوەن بیروباوەڕی بە دیسپلین.

نەبوونی ئۆتۆنۆمیەتی خود، بە بەهانەی بەرژەوەندی گشتییەوە سڕینەوەیەتی لە نەخشەی هەموو پرۆژە چارەنووسسازەکاندا.

لەو ناوەندەدا خودێکی بێ ئیرادە و بێ ئەقڵ... جگە لە بە ئامرازیکردن و دیسپلینکردن و کۆنترۆڵکردن بە دەستی ئایدۆلۆژیاکان، چارەنووسی دەبێ چی بێت؟ گرفتەکە لە درێژماوەدا واوەتر دەچێت، بەناوی یەکبوونی فیکری و یەکبوونی ڕیزەکان بیری ئامادەکراوی بۆ ڕەوانە دەکرێت.. ئەویش خۆی تێ ئەسوێ و بیر ڕەوانە ناکاتەوە. ئیدی گوێگرە.. قسەکەر نییە. فەرمانبەرە.. فەرماندەر نییە. خودێکی نامۆی بێ چییەتی تەنها بەکاربراوێکی مەشق و یاری و مەزات و شەڕ و ئاشتییەکانی فاناتیزمی- دەمارگیری- ناسیۆنالیزم و کۆمۆنیزم و ئاین دەبێت. سەرکەوتنەکانی ئەوان بە مەزنترین سەرکەوتن و ئازادی خۆی دەزانێ. ئەگەر خود

بایەخێکی نەمابێت بۆ ئاوەدانکردنەوە و گەشەکردنی ئازادییەکانی خۆی، دەبێ وەلائی شوناسنامەی چی بێت، جگە لە بریقەدانەوە و پەیڕەویکردنی پەیام و ئەمر و نەهییەکانی ئەو حیزب و باوەڕانەی بەپێی ویستی دروشمەکانیان فۆرمیان پێ بەخشیوە و پڕ کردۆتەوە، جارێک بە شەهید جارێک بە پاڵەوان، بەڵام بەرکەماڵێکی دەروونی و هاوولاتی خۆزگە و بریاکانی دنیا تایبەتییەکەی خۆی نەبووە!؟

خودی کوردی بۆیە نییە و نابووت کراوە، بە مانا کراوەکەی هاونیشتمانییبوون، لەبەرئەوەی حەشاماتێکە داماو بە ئەقڵی خەسیوو، ئیرادەی خاپوور، کاراکتەری خودبێوەر self- denying.

خودی کوردی بۆ ئەوەی وەک نەتەوە یەکگرتوو بێت و هەڵوەشاو نەبێت و لەبەردەمی ئەرک و مافەکانی خۆیدا ڕێزداربێت، نەک لەبەردەم (وەزیفەی حیزب حیزبێنەدا).. تا بوونی تاکەکانی نەچەپێنرێن، دەبێ ئەقڵ و ئیرادەی تاکەکانی دەسەڵاتیان بۆ بگێڕدرێتەوە و هەبێت. ئەگەر نا دەستەوەستان و دژی بەرەوپێشچوونی خۆی دەبێتەوە.

لە بری ئەوەی ئەو بەهایانە بەرهەم بهێنێ کە بارگاوین بە ئازادی، وە گوزارشتێک بێت لە یەکێتییەکی تێکڕژاوانەی هەموو ئیرادەکان، دێت و تۆتالیتێریانە بەهای ئایدۆلۆژیەتە گومڕاکانی دەبەخشێتەوە و دەیکاتە پێودانگی نیشتمانی بوون و نەبوون.

دەشێ یەکێک لە ڕوانگە کارسازەکان ئەوە بێت: هەلومەرجێک بسازێندرێ کە خودێکی تەندروست ترادیسیۆنی خۆی پیشان بدات و لە توانای لێکدانەوەکانی خۆی و سەرگەرمییە ژیاری و فیکرییەکانی ئەویتریش بەهرەمەند بێت واتە- خود خۆی بە هەست و ئەقڵی بناسێتەوە و لەگەڵ بەهاکانی خۆیدا ئاشت بێتەوە.

هەتا دۆستخوازانە لە دەستی بێت، بەهاکانی ئەوانی تریش بناسێت و لەگەڵ پرۆژەکانیاندا بە دیالۆگ و ئارگۆمێنت و بەیەکتر سەلماندن ئاشت ببنەوە.

بێ ئەم سەرەتایە نە لە مافە سروشتی و کۆمەڵایەتییەکان دەگەین، نە وزەی ئەزموونی وەچەکان چاودەکەین و دەتەقێنینەوە، نە لە قەیرانە مێژوویی و دەستکردەکانیش دەرباز دەبین.



یەکێک لە فیگەرە دیار و بنچینەییەکانی مۆدێرنە کە پێی دەناسرا، ناساندنەوەی خودە بە خود و دامەزراندنەوەیەتی لە شوێنی شیاو بە خۆیدا، بێ ئەم هەنگاوە سەرەکییە نە ئازادی و نە ماف و نە ئەرک، مانای خۆیان وەرناگرن لە کایەو نمایشە کۆمەڵایەتییەکاندا. پێش هەر شتێکیش دەبێ حورمەت بگێڕدرێتەوە بۆ جەستە کە موڵکی خۆیەتی و هیچ هێزێک بە هەر بەهانەیەکەوە بێت بەکاری بهێنێت دژ بە بوونە فیزیکی و سروشتییەکەی خۆی.

چونکە هیچ سەروەرییەک بەقەد بەهای جەستە سەنگین و مانادار نییە. ئەمە بیریارێکی وەک پۆڵ ڤالێری هێناوەتە سەر ئەو بڕوایەی بڵێ.. (قووڵترین شت لە وجودی مندا پێستی منە). نیچەش ڕووناکی خستۆتە ئەو فەزایە و گوتوویەتی: ڕۆحم پێستمە!

هەفتەنامەی جەماوەر ژمارە ٢١٩

# خەڵاتی نۆبڵ

سازدانی: یوسف عیزەدین

* بەشێوەیەکی گشتی خەڵاتکردنی نووسەران چۆن دەبینن، بە ڕای ئێوە چ کاریگەرییەکی لەسەر داهاتووی ئەو نووسەرە دەبێت؟

– بەر لە هەر شتێک، خراپ نییە لەوە بگەین لە پشت هەر خەڵات و پاداشتێکەوە مەرامێک، حەکایەتێک، نیازێک هەیە. یەکێک لە دێرینترین ئەو حەکایەتی پاداشت و بەخشینانەش دەگەڕێتەوە بۆ نێو کۆشی ئاین. بنۆڕە لە (ئەمرکردن بە چاکە و.. نەهیکرن لە خراپە) پێ دەچێ یەک لەو ڕەنگرێژکردنانە بێت، کە گوێڕایەڵبوون بەم فەرمایشتە..، خەڵاتێک لە لایەن خوداوە دەبەخشرێ بە بەندەکانی خۆی.

گرنگ نییە خوێندنەوەکان بۆ حیکمەتی ئەم پاداشتانە چین و چۆن دەکەونەوە، بەڵکە گرنگ لەوەدایە مرۆڤ گەرەکێتی ببینرێ و جێگە و ڕێگەی ئەو بینینەیە ئەو دڵخۆش یاخود نیگەران دەکات. هەیە چاوی دەروونی خۆی بۆ گرنگە...، هەیە چاوی یارەکەی...، هەیە چاوی ئەو گرووپەی ئەوی تیا هەڵدەسووڕێ، هەیە چاوی سەرکردە و تەوتەمەکەی... تاد!

واتە لێرەدا کۆجیتۆکەی دیکارت دەبێ بەوەی: (چاوێک من دەبینێت.. کەواتە من هەم) دەشێ بۆ نووسەرانیش یەکەمین خەڵات و پڕبەهاترین خەڵات چاوی تێکست خۆی بێت. بەڵێ بزواندنەکانی تێکستە ئەوانی تر ڕەخنەگران.. خوێنەران.. دەزگا ڕۆشنبیری و چاپەمەنی و دەسەڵاتدارەکانی ڕاگەیاندن و فیکر و مەعریفە ناچار دەکات کە پێداگرتنەکانی.. هاندانەکانی.. پێشبینییەکانی.. نموونەکانی.. هەڵبژاردەکانی.. ناچارکردنەکانی ببینن! هەر بۆیە دەنگ و ڕەنگێک لە ئەفسوونی وشەکانە ڕاماندەگرێت و پێمان دەڵێت: بمبینن و لە گڕ و تینی توخمی ژیانێک کە لە مندا هەیە، کە بە گورزە ڕەوا و ناڕەواکانی فراژبوونی خۆی چووەتە پێش و بووەتە



سەردەستەی ئەنگیزە شاراوە و ئاشکرا پەتییەکانی خۆی.. ڕابمێنن. بنۆڕن لە عەوداڵبوونم بە دوای خۆمدا گەیشتووم بە چی؟ ئێوەش لە پێناو خۆتاندا و هیچی تر ورد ببنەوە لە خاکیبوونی ئەو سیمایانەم، کە سیمای بە تێکستبوونمە. بزانن.....من هاوەڵی ژیانم، یا ژیان هاوەڵی منە..؟

من هەڵقوڵاوی ژیانم، یان ژیان هەڵقوڵاوی منە..؟

من ڕێنیشاندەری ژیانم، یان ژیان ڕێنیشاندەری منە..؟

نووسین: پێ دەچێ گەوهەری ئەو ڕۆحییەتە پرکێش و سەوداسەرەی نێوان بوونی تێکست و بوونی ژیانێک بێ کە هەر دەڵێی ئاوەڵدوانەی سکێکن و شاخوێنبەر و شاخوێنهێنەری دڵی یەکدین.

ئەوەی ئەم تێگەیشتن و ئەنگیزە بەهادارەمان لا بەرجەستە بکات خەڵاتی خۆی و ئێمەی مرۆڤیشی کردووە. چونکە لە سادەترین مانادا پێمان دەڵێتەوە: بوون بێشومار یەکەی جیاواز جیاوازە و بۆ ڕاگرتنی یەکدی پاداشتی بوونی یەکتر دەکەن بە هەموو تەبایی و ناتەباییەکیانەوە. لە هەمان کاتیشدا بوون بەشێوەیەکی ئۆرگانیکی لە خۆیدا ئەم یەکە جیاوازانە وەها لە خۆ دەگرێت کە دەڵێی بێ یەکترنابن و هەڵناکەن و دابەشبوون نازانن. مەوداکانی بوونیش ئەو دەنگ و ڕەنگانەن کە لە مەوداکان خۆی بڵند دەبنەوە و هیچی دی.

گەر ئەو چوونە ناو یەک و ئاوێتەبوونانە نەبوونایە، بوون نەدەبوو بۆ هەمووان. بوون بوونی هەموومانە جا بەخوار ڕوانین یان بە بەرز ڕوانین لێی. بە هەڵاتن و یاخیبوون یان بە لایەنگری و دەستەودامێنبوون بۆی.

نووسەر وەک هەر مرۆڤێکی هەستیار، بەرانبەر چارەنووسی خۆی بەرپرسیارە و وێڵبووی بەختەوەرییەکە کە لە ڕێگەی ئەو مانایانەی دەیدات بە بوونی مرۆڤانەی خۆی، نیگەرانییەکانی بڕەوێنێتەوە، داوەتی ئێمەش دەکات و یەکێک لەو فیگەرانەمان بۆ دەکاتە ڕێگە و یان بۆ دەخاتە سەر گازەرای پشت و دەمانداتەوە دەست تەوژمی زانین و وەسوەسە و دڕدۆنگی و سەوداسەرییە تەمەنکورت و درێژەکانی خۆمان.

تا فیگەری ونبوون و دۆزینەوەیەکی تری خۆمان کەشف بکەین و حەکایەتەکانی ئەم گەشتانەمان بۆ یەکدی بگێڕینەوە. ئیدی گێڕانەوە هەیە لەگەڵ تروکان و هاتنە

دەنگی دەمرێ و سیمای نابینییەوە. گێڕانەوەش هەیە هەزار و یەک شەوە توانای درێژکردنەوەی تەمەنی حەکایەتەکانی خۆی هەیە و کۆتاییهاتنی خۆی دوادەخات. کەوایە خەڵات دەبەخشرێتە ئەو حەکایەتە تەمەن درێژانەی بە سیحر و جوانییەکانیان ناچارمان دەکەن گوێیان بۆ ڕادێرین و لە گەڵیاندا بژین و بیانپارێزین. چونکە پارێزگارییان لە بووژانەوەی ژیانێک بۆ کردووین کە بۆ ئێمە و بۆ بەهاکانی بوونمان بەهادارن. چونکە لە ڕێگەی فەنتازیاگەلێکەوە کە هیدایەتی پێ و ڕێ و ڕۆیشتنی هەنگاوەکانی واقیعێکیان کردووە، بێ ئەو فەنتازیایانە، شکست و سەرکەوتنەکانی نە بەڕێوە دەچوو.. نەدەناسرا.. نە کامڵ دەبوو.. نە تەحەمول دەکرا.

چونکە دەمانگێڕێتەوە بەردەم ئەو پرسیارانەی دەبوو بکرابان و نەکران.. ئەو خەونانەی دەبوو ببینران و نەبینران.. ئەو ئیرادانەی دەبوو بنوێنرێن و نەنوێنران... تاد. ئەگەر خەڵاتکردن بۆ ئەو بەخششانەیە نهێنییەکمان بۆ دەهێننە زمان کە ڕیسکەکانی ژیان پێویستی پێیەتی، تا بە دیار گومڕاییەکانییەوە تاس نەیباتەوە!

لە تەلیسمی سروشتدا، لە نامرۆڤبوونی خۆمان هەڵبێین و.. گاڵتە بە وێردی ئەو تیشکانە نەکەین لەوپەڕی دەسەڵاتی زمانزانییاندا فێری وانەکانی بەخشندەییمان دەکەن!

شەرم بمانگرێت بەدیار هەڵکێشانی ملی ئەو باڵندەیەی تا ماوین ناگەین بە حیکمەتی چەهچەهە و نەغمە و عیشووە ڕشتنی دڵدارییە خۆڕسکەکەی! کەواتە خەڵات بەشێکە لە بوونی مرۆڤ و بگرە گیانەوەر و ڕووەکیش؛ لێ بەهای خەڵاتەکان چۆن پۆڵێنبەندی دەکرێن و لە چیدان، ئەمە جیاوازییەکەیە. بۆ من چاوی تێکست لە گرنگترین چاوەکانە بۆ نووسەران...، دواتر بەهای چاوەکانی تر!

هەر ئەمەش کاریگەری هەیە لەسەر بەهرەمەند بوونی نووسەری ڕاستەقینە. ئەگەر نا پاداشت و خەڵاتکردن هەڕەشە لە تەنیاییەک دەکا کە نووسەر پێویستی پێیەتی، بۆ پاراستنی ئیقاعێک کە دەستی هەیە لە بووژانەوەی دنیای نووسەر و لە قەرەباڵغییە بێ سەمەرەکان دووری دەخاتەوە کە ناهێڵن هێمنانەتر و عاشقانەتر لە جیهانی دەوروبەری ڕابمێنێ و لەزەت لەو لەحزاتانە ببینێ، کە بۆ ئەو مانادارن و ئیستهلاکی ناکەن.



* خەڵاتی نۆبڵ بە گشتی چۆن هەڵدەسەنگێنی..؟ بە تایبەتیش خەڵاتی نۆبڵی ئەمساڵ کە درایە ئۆرهان پاموک. پێت وانییە ناهەقی کرابێت... چونکە ساڵانێکە خوێنەری کورد چاوەڕێی ئەوەن کە بدرێت بە یەشار کەمالی ڕۆماننووس.

– دەبێ پێشوەخت بڵێم : نووسەر لە ڕێگەی نووسینەوە عەوداڵی خۆیەتی و شوناسیش دەدات بە خۆی، نەک لە ڕێگەی خەڵاتکردنەوە.

بەڵام ئاسۆی خەڵاتکردنێکیش مەرجدارییەکەی هەر ئاسۆکانی دۆزینەوە و داهێنان بێ؛ دەبێ گەوهەرەکەی بە هەند وەربگیرێت. چونکە نیازێتی ڕێز بدا بە بەخششەکانی ئەقڵییەت و دەروونێک کە لە فەزای تێکستەکانیاندا جێگەی زۆربەمانی تیا دەبێتەوە و، بە بۆنەی ڕۆح بڵندی و سەوزی ئەوانیشەوەیە؛ ئێمەش دەکەوینە تخووبەکانی بووژاندنەوەوە. بووژاندنەوەیەک کە بنەماکانی پلوڕاڵیەتی فەرهەنگی و هەمەچەشنی کولتووریمان لەگەڵ خۆیدا بۆ دەهێنێ و، خۆیشی هەر لەو زەمینەدا و بەو زەمینەیە ڕسکاوە و خوڵقاوە.

بیرمان نەچێت دەشێ تێکستیش لە سادەترین مانایدا خەڵاتێکی: پلۆڕاڵیەتی ئەقڵی زیندوو و دەروونی زیندوو و زمانی زیندوو و خەیاڵی زیندوو بێت.. دەبەخشرێت بە هۆشی هەمووان، ئێمەش لەگەڵ بەریەککەوتن و کارلێکماندا لەگەڵ تێکستدا ئەو خەڵاتە دەدۆزینەوە.

خەڵاتی نۆبڵیش هەروا چاو لێ دەکەم، کە خۆی بە دەرخەر و هەڵگرەوەی ئەو داهێنان و دۆزینەوانە دەزانێت.. کە دەبێت دەربخرێن و هەڵبگیرێنەوە. کە پێم وایە ئەوە مەرامی ئەلفرێد بێرنهارد نۆبڵ بووبێت. چونکە خۆی داهێنەر بووە و لە قووڵایی ماناکەشی تێگەیشتووە... وە بۆ نیشاندانی نیازپاکی و بێلایەنی داهێنانی زانستی و خۆپاککردنەوەی دەروونیش لە هەستکردن بەو گوناهەی کە دینامیت کارەساتباری خستۆتەوە ئەم خەڵاتکردنەکەی بۆ داهێنان کردە وەڵام بۆ ئەو دەسەڵات و گرووپە نیازخراپانەی پەیامی زانست دەگۆڕن و، هیدایەتکردن و ڕێزلێنانیش بۆ بیریاران و داهێنەران.

بەڵام ئەم خەڵاتە مەرج نییە وەک مەرامی خۆی لە نێو هەڵبەز و دابەزینی مەرامە

سیاسی و نێودەوڵەتییەکاندا وەکو خۆی بچێتە پێشەوە. وەکو چۆن داینامێت بۆ مەرامی وێرانکردن بەکار برا... دەشێ ئەمیش لە ژێر قامچی غەدرەکاندا دەرنەچێت. ئەوەتا پیاوێکی جوانی وەکو ئەلبێر کامۆ دەبێژێت: نیکۆس کازانتزاکیس (سەد ئەوەندەی من شایانتری خەڵاتی نۆبڵە). ناخوازم لە باسەکە دوور بکەومەوە بەڵام ڕۆشنە هەموو جار ئەوە تێکست نییە دەخوێنرێتەوە، بەڵکو ئەوە شارستانییەتە لە بەرچاو دەگیرێت، بۆ وەرگرتنی ئەم خەڵاتە. ئەم قسەیەشم ئەوە ناگەیێنێت پێم وانەبێت تێکست لە دەرەوەی شارستانییەتەکان لە دایک دەبن. بێ پەردەتر هەتا نووسەرێکی عەرەب و تورک و فارس هەبێت، ئەو خەڵاتە نادەن بە نووسەرێک کە میللەتەکەی ژێر دەستی ئەوان بێت. چونکە ئەمە کێشەی سیاسییان بۆ قیت دەکاتەوە. ئەگەر چی ڕێکەوتیش نییە کە ئەمەریکا لە پێشی پێشەوەی ئەو وڵاتانەیە کە ئەم خەڵاتەی وەرگرتووە لە بواری زانستدا.. دواتر ئەڵمانیا و.. بەریتانیا و... لە ئەدەبیشدا فەرەنسا پێشڕەوە، کە شارستانییەتی ئەمانەش پەنجە درێژکردنی ناوێ! زۆرم نەوتووە گەر بڵێم کورد تا نەچێتە مێژووەوە بە مانا هیگڵییەکەی کەسی شایستەی نۆبڵیشی هەبێت نایدرێتێ... ئەگەر درا ئەوە بزانە دەبێ بە دەوڵەت، با ئەم قسەیەم وڕێنەیەک بێت و بەس!

مەلەفێک بوو بە ناوی (چییەتی گەمەی خەڵاتکردنی
نووسەران) لە گۆڤاری ڕامانی ژمارە ١٢١دا

## سەگکوژەکانی ئەمڕۆ.. جوانکوژەکانی سبەینێن!

وای لە جینۆسایدی (سەگە هار و خوێڕییەکان).. کە دووچاری (هاربوونی) هەوەس و (خوێڕێتی)- خودی- خۆشمان دەکەن. یەکبینە پەی نەبردن بە سامناکی ئەو توندوتیژییە تیژبینە ئاسنینەی لە ئاست- سەگی بەوەفای- دێیە بەرکەنار و ئاوەداننەکراوەکانمان هیستریایانە بە ڕێکخراوە و دەخرێ. تەخسیرکردن و بێ هەڵوێستی بەم تەرزە تراژیدیایە ماتەمهێنە.. گیانی- نەریتەکانی جوانی- و ماهیەتی ئەخلاقیمان- دەردەکێشێ!

ئاخر ناکرێ چاوپۆشی و ڕێگە بەو ناحەزادییانە بدرێ (کە بێ خەیاڵە لە تیرۆرکردنی حەوت هەزار سەگی ئاوارە لە ماوەی مانگێکدا). ئەم قێزەونکارییە بێ حورمەتکردنێکی بێ حەیایانەیە بە هارمۆنیکییەتەکانی نێو ژینگە و کوشتنی تانوپۆی ئەو هێزە ویژدانییەشە کە- پێگەی ئەخلاقی- ئێمەی لە بەرانبەر میکانیکبوونەوەی ژیاندا ڕاگرتووە و.. لەنگەرگای شوناس و بەها بە بەهاتە میرات بەجێماوەکانی مرۆڤبوونیشمانە.

ئەو بەها گەلەی یادمان دەهێنێتەوە: توندوتیژی بە هەر پاساو و ڕووبەندێکەوە بێت لە بەرانبەر ڕووەک و ئاژەڵدا ناپەسەندە، بە هەر بیانوو هێنانەوەیەکی بوغزاوییانەوە خۆ پەردەپۆش بکات. ناشێ گوێ بۆ وەعز و پەند و سەرگوزشتەکانی توندوتیژی و.. پێودانگەلە پڕ گزی و فزی نمایشکەرە ڕۆح پیسبووەکان ڕابدێرین!

زۆر بە سادەیی ئەم بزاوتە گۆبەندسازە نارەسەنە دەستدرێژیکردنە بۆ سەر بنەما بەفەڕەکانی- ماف ویستی- و پێشێلکاریی مافی ئەوی دییە و.. بەخەبەرهێنەر و دنەدەری پەروەردەکردنەوەی شەڕەنگێزیشە لە نێوان ڕایەڵە هەستپێکراو و هەستپێنەکراوەکانی- غەریزە و ئاگامەندیماندا. ئەمەش پەیڕەوکردنی گفت و بەڵێنەکانی بەرپرسیارێتیمان پەک دەخات و دەپووکێنێتەوە و ناوئاخندارییە ویژدانییەکەیمان لێ بزر دەکات.لە بەرانبەر نا دادپەروەرییەکدا کە سەر بە کولتووری



تەورە- و لە درێژبوونەوەیدا لێ ناگەڕێ بچینەوە سەر ڕێگەکانی- ئاکار دۆزی- و خەونە ئینسانییەکانمان سەرەونگون دەکات و سەری خۆشمان دەخوات.

بەڵێ... لە هەر شوێنکاتێکدا توندوتیژی بە ئاشووبە میزاجسالارییەکانییەوە لە بەرزەفڕیدا بن و ملهوڕئامێز بن.. لە نزیک ماوەدا مژدەدەری ئۆردویەک لە بوونەوەری ڕۆح گزگلی وەها دەبین کە وشکبووەیە: لە ئەنگیزە تەڕەکانی ژیان و.. دۆڕاو لە بایەخەکانی جوانی و.. دەماغ خەسیو و.. دەروون لاواز و بەتاڵ و.. زەین سووک و نزمیش، لێمان دەبنە دەستپێکەر و.. دەمڕاستی پێداویستییە ڕۆحی و مادییەکانمان! لەو نیشتمانەی ئەو (قارەمانە) سەگکوژ و.. کەرکوژ و.. ژنکوژ و.. داڵدە دەدا و دەلاوێنێتەوە! چۆن چۆنی دەتوانین بەرگەی بێدەنگی بگرین و.. چاوەڕێ بین مافەکان یەخسیرزەدە و گەمارۆ نەدرێن بەتەنگژەکانی خەساندن و لە باربردن؟ ئەفسووس...ئەو هێزە زبرەی لە بەراییدا سەگکوژی دەکاتە عادەتێکی خۆش بۆ ئەنگیزە نەخۆشەکانی خۆی! بێ ئەملا و ئەولا بەپووچێتییەکەی دەیدرکێنێ خۆ سازێنەرە بۆ سەرکوتکردن و خۆ مەشقپێکەرە بۆ مرۆڤکوژیش!! بێ پەردەتر.. داخوا جارێکی تر ئەمە بەربوونەوەی ماهیەتی وجودییانەی ئێمە نییە بۆ ناو مەحەک و هاوکێشەکانی (جەللادبوون و قوربانیبوون)؟

هەفتەنامەی ئاوێنە ژمارە ٦٣

## (دوعا)ی

## خۆش+ویستن و - ویست+کوشتن

به گیانه تەنیاکەوتووەکەت (دوعا) خانم؛ ئەگەر ئێمەی جەللاد (کەمێک ئەقڵ و.. کەمێک دڵ و... کەمێک باوەڕمان) هەبایە؛ هەتا نوقسانییە وجودییەکەمانی پێ پڕ بکەینەوە و هەڵچنین!

باوەڕناکەم پێویستییەکمان بە ئێرەیی بردن ببوایە دەرهەق بە (هێزە ئیرادەییانەکەی) ئەقڵ و دڵ و باوەڕی تۆی کیژۆڵە! ئێمە گوتمان: مادام چیدی ناتوانین ئاشق بین.. (دوعا)ش بۆی نییە ئاشق بێت!

دڵ لە دڵ مەدە.. ئێمەی کاڵفام بەم نەعلەتکارییەمان تەنها تۆمان سەنگەسار نەکرد؛ بەڵکو جوانییە فەرامۆشکراوەکانی ژێر دار و پەردووی کەلاوەکانی ئایدۆلۆژیا و مەزهەب و ڕەسەنییەتەکەی نێو خودی ئینسانییانەی خۆشمان بەردەباران کرد و، بۆ تاوێک بوارمان پێ نەدا گوێ بۆ دەنگیان، لە دەروونە نەخۆش و لە جێ چووەکەماندا، ڕادێرین.. هەتا لە بەخەبەرهاتن و چاکبوونەوەیەکدا بزانین، چۆن بۆمان دەدوێن و چیمان پێ دەڵێن!

گەرچی لە کوشتگەکەدا بە کەڵبەکانمان کانیبالانە شەلاڵی خوێنیشمان کردبوویت، کەچی تۆ بەزەییت بە پیاوەتییە بچکۆلەکەماندا دەهاتەوە. ئەوە بوو بەزمانی پڕ لە ئاه و نالەی جەستەت نیشانت داین: من.. گەرچی مرۆڤێکی یاخیشم لە هەر دابونەریتێک کە بۆ ئازادییەکانی ڕۆحم تەنگەبەر بێت، بەڵام من.. (بۆ یاخیبوونەکەم دەتوانم تاڵاوچێژ و ئازارکێش و ستەملێکراو بم، وەلێ لە دەستم نەهاتووە و نایەت ئازاردەر و ستەمکار بم!)

ئەگەر خوا نەکردە وەهابام، ڕۆحم بە نەرم و نیانییەکەی نەیدەتوانی کەسێکی تری خۆشبوێ!

ئەگەر خوانەکردە وەهابام، لەگەڵ ئێوەی مێگەلدا دەبووم و منیش تفباران و





جنێوباران و نەفرەتباران و بەردەبارانی ڕۆحێکی ئاشقم دەکرد! وای لەو مردنە پڕ شەرمە!!

منی ئاشق حەز دەکەم و پێم شکۆمەندانەترە بمرم.

بەڵام بۆ هەناسۆکەیەکیش بێت جورئەتم نەدەکرد لەبەر ئاوێنەی ناخمدا خۆم بێ هەست و بێ دڵ ببینم! ئاخر بێدڵییە جیهانی وێران کردووە و وێرانتریشی دەکات! قیژاندن و فیغانەکانیشم بە ڕووی بێ ویژدانییەکانیشتاندا تەنێ ئەوەبوو.. (ویژدانتان ئەگەر هەتانبێ) بەڵکو خودایە لەو کەڕییەی و دڵتان لەو لاڵییەی ڕزگاری بێت و چی تر ئۆباڵی مەرگی هیچ مرۆڤێکی تر نەخەنە ئەستۆی ملتان.

کە جەستەی بێ ئرادەکراوی خۆمم ئاوها بە ڕووتی بینی و لیکی شەهوەتێکی شاراوەش بە لمۆزتاندا دادەچۆڕا پێم وابوو ئەگەر...,

* مەسیحێک بە موعجیزە لە نێو دەروونە کرمەڕیزبووەکەتاندا هەبایە؛ دادپەروەرانە ئاوای پێ دەگوتن: کامەتان لەو کیژۆڵەیە.. (دوعا) دەست و دەم و دڵ و داوێن پاکیزەترن با بەردێکی تێ بگرێ. ئەوجا ئێوەش لە بوغزنی و پیسییەکانی نێو دەروون و هۆشە چرووکەکەتان خەجاڵەتیتان دەکێشا و بەردەکان کە نەگریسییەکەتانە لە دەستە لەرزۆکەکەتان بەردەبووەوە.

* ئەگەر- زۆربا- یەکیش (دڵنیام جەللاد زۆرباناس نییە) لە خێڵەکەماندا هەڵبکەوتایە، دەبووە سوپەر و قەڵغان بۆ تەنیا باڵییەکەم و دەیفەرموو: وەرن لە بری (دوعا) من بکوژن- واتە- زۆربا سەرفیراز و بە ئیرادە و ئازادەکەی نێو خۆتان.

داخم کە مەسیح خۆی لە خاچدراوی خۆشەویستی بێت و هێشتا سەمایەکی زۆربایانەش کۆڵنج و بەستەڵەکەکانی ئەقڵی دڵ و دڵی ئەقڵ و دەروونتانی خاو و ڕەوان نەکردبێتەوە؛ ئیدی من چۆن بە دەستی ڕۆح ئەتکراوەکان، ئەتک ناکرێم؟!

تۆ.. ئەی ئەوانەی بەردتان تێ دەگرتم؛ چەند جار لە منالی و هەرزەکاریتاندا ملتان ئاوەتەبەر شەڕە بەرد و شەڕە چەقۆ و شەڕە سەگ و شەڕە کەڵەشێر و شەڕە گەڕەک و لە هەراش بوونیشتاندا شەڕە حیزب و شەڕە باوەڕ و شەڕی کەرامەتدا سەر و دڵ و کبریائتیان شکاندووە؟

ئایا ئێوە لە دەستتان هاتووە.. واز لە تۆڵە بهێنن و (خاشاکی ئەو یادەوەرییانەی

نائاگاییتان بگۆڕن بە ئاڵتوونی ئاگایی؟).. بڕوا ناکەم! ئەوەتا بە بەر چاوی کامێراوە جەستەی من کرووشکەی کردبوو.. بڕستتان لێ بڕی و.. زەلیلتان کرد؛ کەچی مووچڕکەیەک بە گیانە بێ گیانەکەتاندا نەهات. بەڵکو فڕکان فڕکانی ئەوەبوو کە بچووکییەکەتان لەسەر منی شکستەباڵ تاقی بکەنەوە!

تۆ.. ئەی ئەوانەی پێڵەقەتان دەکێشا بە دەموچاومدا، چەند جار مامۆستا بەڕێز و بە شەرەفەکانی خێزان و قوتابخانە و مەزهەب و حیزب دەمکوتیان کردووی هەتا گوزارشت لە خودی خۆت نەکەیت؟ هەی دەمکوتکراو بۆیە بێباکانە لە دەمت هەڵدەدام، چونکە (تۆی ڕاهاتوو بە کۆیلەتی لە ئازادییەکەت دەترسێی)!؟

تۆ.. ئەی ئەوانەی پاساوتان ئەوەیە لە دین و ڕەسەنێتی خۆم هەڵگەڕاومەتەوە! خۆتان لەمە زیاتر فریومەدەن، لە فەرهەنگی ئێمەدا کە شێخی سەنعان بۆ کچە گاورێک لە دین وەرگەڕا، نەک گەلەگورگ و کەمتیار و دەڵەک هەڵیاننەدڕی.. بەڵکو لە گوڵستانی لیریکییەتی شیعر و گۆرانی لە داستانی میللیدا گوڵباران کرا. یاخود کێشەکە ئەوەیە ئەو عاشقە ڕۆح بەرزەفڕە نێرینە بووە و منیش مێینە؟

هەتا بگەنەوە بە مرۆڤە بزربووەکەی نێو خۆتان و هێندەی تر نوقمی تاریکییە بێ پەییەکانی نێو دەروونە چەپەڵ بووەکەتان نەبن و فریادڕەسێک کە دەستی ڕۆشناییە ببیننەوە.. دەتانخەمە بەردەمی دوو ئەرک:

یەکەم– هەمیشە دوو شت بە عیشقەوە لە بیر مەکەن و لە باوەشتاندا بێت (ژن و کتێب) هەتا گوڵاوێکی یەزدانییانە بە دڵتانا بدا و شنەی شەماڵی شادمانییەک بە ئەقڵتاندا گوزەر بکات. کە بە داخەوە هەنووکە لەو شادمانی و بۆنە خۆشە بێبەرین. بۆیە زۆر سانا بە دەست و دڵی پیسەوە.. دوعا عیشقییە دەردەستەکانی منتان بە نەعلەت کرد.

دووەم– لەگەڵ مامە سێوەی ئاشقدا بڵێینەوە: (ئەمن دۆعایەکی دەکەم) هەموو بڵێن.. ئامین. یاخوا هەر کەس دەبێتە باعیسی دوو دڵان.. خێر لە ماڵ و مەنزڵی خۆی نەبینێ، ئامین.

وەیلێ.. وەیلێ

هەفتەنامەی جەماوەر ژمارە ٢٢١

# گفتوگۆ لەسەر خوانی خوێنین

سازدانی: حەمە کاکەڕەش

**– ئەگەر بهاتایە ئەنفال لە وڵاتێکی ئیسلامیدا ڕووی نەدایە و هەروەها مانایەکی ئیسلامیشی پێ نەدرایە، پێتان وایە ئەنفال بتوانرایە نوقمی بێدەنگییەکی وا بکرێت، هەم لە لایەن وڵاتانی دراوسێوە تا دەگاتە هەموو وڵاتە ئیسلامییەکانی دونیا، ئەوسا وڵاتانی ئەورووپی.**

– جۆرێک لە بێدەنگی هەیە، ئەو ساتەوەختە دەست پێ دەکات کە گەمارۆی بکەر و ئەوەی شاهیدیشە دەدات، هەتاوەکو ئامادەیی ئەوەی نەبێت، کارەسات و ڕووداوەکە وەکو خۆی بگێڕێتەوە. واتە لەو بابەتە بڕوانێت و لە کاتی دانپیانانەکەیدا (خەسڵەتە چەسپاو و نەگۆڕەکانی) ئەو بابەتە دەقاودەق بخاتە ڕوو.

بە بارێکی تریشدا بۆ ئەوەی مانا شاراوەکانی ڕووداوێک بخرێنە ڕوو دەشێ سەرنج و ڕاڤە و ماناگەلێکی تری پێ ببەخشرێت، جا لۆگۆسییانە بێت (ڕاڤەی لۆجیکانە و ئەقڵییانە) یان میتۆسییانە (ڕاڤەی خواوەندانە و شاعیرانە). ئاخۆ ئێمە دەکەوینە کام بەشی ئەم بێدەنگکردنانەوە؟

بێدەنگی ئەقڵانی.. ئەخلاقی.. ئیستاتیکییانە... تاد

کورد وەک نەتەوەیەک نقومی سێگۆشەی بەرمۆدای کولتوورەکانی فارس و.. عەرەب و.. تورک بووە.

بە هەرسێ پنتی نائەقڵانی و.. نائەخلاقی و.. نائیستاتیکییانەوە! پێ دەچێ ئەمە یەکەمین پێگە و سنووری دەستپێکردنی بێدەنگییە فەرزکراوەکان بێت.. بێدەنگییە ناقۆڵاکان!

تۆ سەرنج بدە لە کرۆکی ئاینی ئیسلام، لە یەکەمین سروش کە دابەزیوە و نێردراوە بۆ پەیامبەر (د.خ) پێی ڕاگەیێنراوە: «بخوێنێتەوە» ئەویش فەرموویەتی: «نازانم».



دووبارە بە گوێیدا دراوەتەوە «بخوێنە بە ناوی ئەو خودایەی.....» لێرەوە– دەنگێک– هەیە کە دەنگێکی پیرۆزی بێ مەرزە. ئەو بێ مەرزی و بێ پایانییەش دەتوانرێ نیشانە گەلێک بن بۆ– هێز و دەسەڵات– .

ئەم دەسەڵات و هێزەش دەسپێردرێت بە دەستی کەسێک کە لە لایەن خاوەن دەنگی یەکەمەوە شایەنی ئەو– ڕۆڵ و ئەرک– بینینەیە، کە ئەویش پەیامبەری ئیسلامە. کەوابێ لە بەرامبەر– بێدەنگییەک– کە هی پەیامبەرە) ئەمر پێکردنێک بە گوێگرتن و خوێندنەوە ئامادەیی هەیە– واتە– تۆ کارت بیستن و جێبەجێکردنە– و ئیرادەی خودای لەسەرە کە لە سەروو ئیرادەی ئینسانییانەی خۆتەوەیە!

ئیدی ئەم هەرەمی دەسەڵاتەش لەوێوە لێژ دەبێتەوە و دێتە خوارەوە بۆ ئەوانەی بە دوایدا دێن. ئەمەش ئەو ڕاستییەمان پێ دەڵێت: ئەوەی نزیکترین پشت بێت لە پەیامبەرەوە.. پیرۆزترە.

بەو مانایەی لە بازنەی یەکەمدا کێ ئامادەیی هەبووبێت و زووتر گوێی بە پەیامەکان ئاودرابێت و بیستەری دەنگی یەکەم بێت. لە بازنەی دووەمدا کە بڵاوکەرەوە و گەیێنەرە سەرپشک کراوە و زیاتر دەتوانێ دەنگ هەڵبڕتر بێت. چونکە هەڵگری (ڕیسالەتە) لەو کاتەشدا و لە نێو بازنە یەک بەدوایەکەکانیشدا جیاوازی نییە سەر ئەوەی سەربە چ نەژاد و گرووپێکی کۆمەڵایەتی و میللەتێکیت، چونکە جیاوازی لە نێوان عەرەب و عەجەمدا نییە تەنها جیاوازییەک هەبێت لە (تەقواکردندا) یە. کەواتە ئوممەتی ئیسلام مەرزەکان دەبڕێت و بە پلەی تەقواکەی جێ و ڕێگەی دێت و دەپێورێت. بۆیە (مورشیدی کامیل.. دەبێ هەڵسونیشتنی موو بە موو لەگەڵ کردار و سوننەتی پێغەمبەری گەورەدا ڕێک بێت، موویێک لانەدات).

گوێگرتنی دووەم لە ماڵی خوداوە دێت کە مزگەوتە. جارێ دونیا کشوماتە.. پێش نەغمەو جریوەی باڵندان.. بەرلەوەی هەر چالاکییەک بنوێنرێت، گوێبیستی بانگدان دەبین و (فەرزە) کە شایەتی بدەیت (کە هیچ ئیلاهێک نییە) جگە لە ئەڵڵا و.. پەیامبەریش نێردراوی ئەڵڵایە. ڕۆژی پێنج جار ئەمە ئاوی گوێی پێ دادەدرێ. جگە لەوەی لەگەڵ لە دایکبوونماندا.. کە هیچ فراژبوونێکی جەستەیی و دەروونی لە ئێمەدا پێ نەگەییوە.

بە گوێدا بانگ دەدرێت بە ناوی خوداوە ئێستا تۆ ناوت فلان کوڕی فیسارە... تاد

ئێمە گەورە بووی نێوان هەموو ئەم دەنگە پیرۆزانەین و ئاگایی و نائاگاییمان بەم دەنگانە جۆشدراوە و شێلراوە و ئاخنراوە و سیخناخە.

وە هیچ یەکێک لەم دەنگانەش لە پەیامبەرەوە بیگرە هەتا موریدێک بە دیالۆگی نێوان دووکەس نەهاتووە. کەسێک دەنگ هەڵدەبڕێت.. تۆ دەنگ دەبیستیت. گرنگیش نییە تۆ تێدەگەیت یان نا.. ئەسڵی پەیام ئەوەیە فەرزێک هەیە، سەرنویشتی تۆیە و دەبێ هەمیشە لە زیکریدا بیت و جێبەجێ بکرێت. ئەم (تەزکیەی نەفسیش) نابێت هەتا بێدەنگ نەبیت! مەگەر هەر ئەوکاتانە دەنگ هەڵبڕیت کە لە تەهلیلەدایت. تەهلیلەش زیکری خودایە بە دەنگی بەرز. ئەمەش دەچێتەوە سەر (زاهیری شەریعەت) و (شەریعەتیش درەختە و تەریقەت پەلوپۆین و حەقیقەتیش میوەکەین).

لەبەرئەوەی جەستەی کورد لە نێو ئەو سنوورانەدا کە بۆ دید و ڕوانینی تاکڕەهەندانەی تورک و فارس و عەرەب غەریب و زیادەیە و.. هەڕەشە لە قەوارەی ئەو وێنایانە دەکات کە سێ جەستەکەی تر هەیانە بۆ هەیبەتی خۆیان. چونکە هەم خۆیان بە (ئێوە چاکترین کۆمەڵن لەناو مەردمی دنیادا سەرو هەڵدا) دەزانن و تێدەگەن.. هەم نەتەوەی دەست ڕۆیشتوون و گەیەنەری (ڕیسالەتە) کەشن. ئەم سێ جەستەیە بە جیاوازی ئەو سوپەرئیگۆیە.. پەنامەکی و ئاشکرایانەی بۆ خۆیان دروست کردووە و ڕۆناوە، لە شتێکدا یەک دەگرنەوە، کە هەریەکەیان پارێزەری بەرقەرارکردنی گەوهەری ئیسلامن.

وە هەرسێکیشیان بە جیا و دابڕاو لە یەکتری سیستەمێکیان لە کۆن و تازەدا دامەزراندووە و تاقی کردۆتەوە کە ئایدۆلۆژییەتەکەی دین بووە، بە سەفەوی و عەباسی و عوسمانلییەوە. ئەم تەقواکردنەش نەک نەبووەتە مایەی برایەتی.. بەڵکو لە پراکتیکدا پتر بۆ دەستڕاگەیشتن بووە بە ئامرازگەلێک بۆ (دەرکەوتنی خود بە سەنتەرکردن) و ڕەتکردنەوەی ڕۆڵی ئەوانی تر. جا بە مانا دینییەکەی بێت.. یاخود مانا سیاسییەکەی.

بە هەڵەدا ناچین گەر بڵێین: زۆرجار کۆک و تەبایی ئەوان تەنها لە بەرامبەر کەمایەتی و ئەو نەتەوە و گرووپانەی سەر بە ڕەگەز و ئاینی ئەوان نین و غەیرەن لەو



ئایەتەدا خۆی نمایش دەکات کە دەفەرمووێت:

«أقتلوهم بالأهمال..........»

لە لەنگەرگای فەرهەنگی سیاسیانە و مێژوویی هەموویاندا بێ جیاوازی مانادارbووە و کاری پێ کراوە.

بەد گومانکارییەکانیشیان هەر بەمانەوە نەوەستاون، بەڵکو پەیتا پەیتا هەژموونی جەستەی خۆیان بەسەر ئەو غەریبەیەدا کە کوردە فراوان کردووە، هەتا لە چاوی ئەو وڵاتانەی بە جۆرێک لە جۆرەکان یاساگەلێک هەن کە بەرگری لە چەمکگەلی ئازادی و مافەکان دەکەن، کورد بخزێننە کەناری نەبوونەوە و لە دەستی نەیەت بە دەنگ و زمانی خۆی جەستەی بریناوی و فەرامۆشکراوی خۆی بخاتە ڕوو و.. بتوانن بە ئاسانی و بەو شێوەیەی خواستی ئەوانە، بوونی ڕاستەقینەی کورد چاودێری بکەن و.. حەشار بدەن و.. دواتر لە چەندین ڕێگەی ترەوە.. دەستەمۆی بکەن و لە خودی ئینسانییانەی خۆیشی پاشەکشێی پێ بکەن و ئەو سەرکێش و یاخیبووەی بەرەنگاریش دەکات تەفروتونا بکرێت و ئەوەی دەمێنێتەوە نووزەبڕاوانە لە ژێر زەبری ترساندن و سزا گەلێکی سایکۆلۆژیدا کەرامەت و کبریائە ئینسانییەکەی وێران و.. مەسخ بکەن و.. بێتامی بکەن و.. خۆی و مانا تێکشکاوەکانی خۆی لەبەر چاو بکەوێت و.. لە دواجاردا خۆی بۆ هەموو (ئەمر و نەهی)ەی (چاکە و خراپە)کانی ئەوان بەدەستەوە بدات و بگاتە خۆکوژی ماهیەتی خۆی بە دەستی خۆی!

پێم وایە.. (جاشێتی و براکوژیش لە قوولاییدا) یەکێکن لەو ڕەمز و فیگەرە پاڵنەرانەی کارێکی وەهای کرد لە بوونی ئینسانییانەی خۆمان هەڵبێین و، بێهێزبوونی دەنگی ئێمە و.. دەستەوەستانیمان لە بەرامبەر بەهێزبوونی دەنگ و پلان و دوورنماکانی ئەوان بخاتە ڕوو، کە بە داوەشاندنی ئێمە شکایەوە و خۆمان لە هەموو بەهایەکی بەرزی مرۆڤانە داماڵی و نکوڵیمان لە گەوهەرەکەی ئەو دروشمانە کرد خۆمان پێ ئارایشت کردبوو. هێرشی جاشەکان لە ئەنفال و.. ئەتککردنی یەکتر لە شەڕە ناوخۆییەکانی شاخ و شاردا باشترین بەڵگەی ئەو تراژیدیا ئەخلاقی و سیاسییەی ئێمەن، کە هێشتاکە بە پەرۆش نین ئەو ڕەگوڕیشە داکوتراوەی کە لە بوارە جیاجیاکاندا ماوە دەربکێشین، پێشمان وایە ململانێی فیکری ئەمە لەئێمە

دەخوازێت.. نەک گیانی دەستبەسەراگرتن.

پانۆرامای ئێمە و داگیرکەرە بێگانەکانیش هێندە تەمومژاوی و ناڕەوا و ناهاوسەنگە، بەو مەودایانەی نێوانمان کە شکست پێدان و بچووککردنەوە و خوێناویکردنی جەستە و ڕۆحی یەکترە.. هێندە قەیراناوییە، وا بەئاسانی و بێ سڵەمینەوە ناتوانین دڕدۆنگییەکانمان بڕەوێنینەوەو بچینە هیچ پەیمانێکەوە کە لەسەر بنەمای درۆ هەڵنەچنرابێ.

با لە دراوسێتییەکەی ئەم سێ جەستە گومڕابووەش ڕابمێنین و ورد ببینەوە، کە ئێمەیان لە نەخشەی پڕۆژە جیدییەکانی کۆمەڵگەی خۆیاندا ئیهمال کردووە و کردۆتە دەرەوە. لەگەڵ یەکتریدا ئاشتی پەروەر نین و پڕپڕن لە تێکشکانی مێژوویی و هەریەکەشیان بە بەڵگەوە بێت یان ڕەمڵ لێدان، دەرهەق بە نسکۆ و نشوستییەکانیان لۆمە و سەرزەنشتی ناڕاستگۆیی و تەڵەکەبازییەکانی یەکتر دەکەن. ئەو مێژووە ڕووگرژەی لە نێوان تورک و عەرەب و عەجەمدایە ڕۆشنە و بۆ ڕووهەڵماڵینی پەنجە درێژکردنی منی گەرەک نییە. گرێچنی تەنگژە و شەڕوشۆڕ و گەندەڵ کارییەکانیشیان شاهیدی ئەوەن. کە تا ئێستا ئامادە نین و پێیان ناکرێ بەو میتۆدە تاکڕەهەندە داخراوە بەپێچ و دەورە خوێناویی و پیلانگێڕییانەوە کە لە فۆرمی جیا جیادا هەر خۆی دووبارە و درێژ دەکاتەوە، بە هەماهەنگی پێ بنێنە قۆناغێکی تر و گرژییەکانیان خاو بکەنەوە و نەهێڵن و.. لەسەر خوانێک کە لەسەر بنەمای مۆڕاڵێکی نوێی هەموویان بێت تەقەللا بکەن و کۆ ببنەوە.

خوانی ئاشتی و متمانەبوون بۆ یەکتر چێ بکەن و بگێڕنەوە.

ئەوەی لێرەدا پێویستمان پێیەتی ئاماژەی پێ بدەین ئەو ڕاستییەیە؛ تێبگەین دراوسێتی لە سادەترین ماناکانیدا، لەسەر داڕماندن و مایەپووچکردنی ئەو مانایانەی، دەبنە خەسڵەت و پایەگەلێک بۆ دراوسێتی و ڕاگیرکردنی بەهاکانی دراوسێتی بە ڕکبەرکێ و ڕێگریکردن لە چوونە ناویەک و کارلێکی ئەو مانایانەوە) کە ڕێز لە بنەمای چییەتی و نەریتی پڕ بەهایانەی هەریەکەیان دەگرێت.. نایەتە دی!

نایەتە دی.. چونکە پەیوەندییەکی ئاوها بارگاوی بە نابەرابەری و بێ متمانەیی و بە کەمگرتنی ماناکانی یەکتر و خوێن، جێگە و فەزایەک شک نابات بۆ گوزارشت لە



ئاقار و کۆی ڕوانینە جیاوازەکان- واتە- شتێک نامێنێ بۆ گفتوگۆ لەسەر ئەو کۆدانەی پرۆسەی یەکترناسین و ئاشنابوون ئاسانتر دەکەن. بەو مانایەی بەر لەوەی دەرگا لەسەر یەکتر بکرێتەوە و ڕووبەڕوو ببنەوە، لەو دیو دەرگا داخراوەکان (دامەزراوە سیاسی و کولتووری)یەکانەوە کە زیاتر مەنەلۆجین.. هەتا دیالۆگ بن، لەسەر ئەو وێنایانەی چنیویانە.. حوکم بەسەر وێنەکانی یەکتریدا دەدەن!

دیارە هەر وێنەیەکیش لەسەر بنچینەی حوکمە پێشوەختە ستریۆتایپییەکان درابێتن، هەمیشە ستاتیکی (ثابت) و شێواو و لێڵ و ناتەواوەو پشت بەستوو نییە بەو ئارگۆمێنت و لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنە بێلایەنانەی دینامیکییەتی (متحول) هەقیقەتە جیاوازەکان دەسەلمێنن.

لە فەزایەکی ئاوهادا لە بری ئەوەی ماناکان لە نێو یەکتریدا ئاوس ببن و بزێن و واوەتر بەرزتر ببنەوە و چییەتییەکی تر ببەخشنە بنیاتی خۆیان و ببنە مایەی ئەکتیڤکردنی میکانیزمەکانی خۆیان و.. ماناکانی یەکتر، دەبنە هۆی نابووتکردن و تیرۆرکردنی ئەو مانا و بەهایانە.

ئەگەر پەیوەندییەکیش هەبووبێت تەنها و تەنها لە کایەی سوودخوازییەکی زووتێپەڕدا بووە، نەک لە هەناوی لێپرسراوییەتێکی هۆشیاری و شارستانییانەی وەهاوە هەڵقولابێت کە دابینکەری ڕێزگرتن بێت لە مافی تایبەتییەتە کولتووری و مێژووییەکانی یەکتر و تێگەیشتن بێت لێیان و ئەگەری دەوڵەمەندبوون و کرانەوەی زیاتری بۆ دەستەبەر بکەن، بێ ئەوەی سەروەرییەکانیان تووشی بەدگومانی و سڵەمینەوە و ترسانێکیان بکات لە بەرامبەر بوونی یەکتر.

ونبوون و نەبوونی ئەو میکانیزمانەی تێکشکێنەری لەمپەرەکانن، بەپێچەوانەوە تەنگژەسازن و لەوێدایە زمانێک دەخەملێت تەنها کاری ئەوەیە بڕیار لەسەر چاکی و پاکیزەیی و بێ گوناهی و نیازپاکی خود و..

خراپی و نغرۆکردنی ئەوی تر دەدات.

ئەوی تر ئەگەر هەڵگری خراپییەکیش نەبێت لە خودی خۆیدا، خراپییەک کە ئامادەیە و لە لایەن، دەوڵەتی یەک فیکر و یەک باوەڕ و یەکڕیزی و یەک ئامانجەوە بەرهەم دەهێنرێت پێوەی دەلکێنرێت و زەحمەتە لێی ببێتەوە.

وە لەبەرئەوەی هەموو گەل و نەتەوە لە دەوری ئەو پەیام و دەرئەنجامە سوپەرمانایە چەقبەستووانەدا هەڵدەخڕێنێت و بە گەڕ دەخرێن، کە ئەو ڕەوشە لە پراکتیکدا دژ بەوانە دەبێتەوە کە گومان لەو یەکڕیزی و تاکڕەنگییە پۆڵاین و پیرۆزکراوە دەکەن کە زۆر سادە منداڵدانی تۆتالیتاریەتێکە لە ناوەوە بنیات دەنرێت، بۆ ئەوەی شوورەش بێت لەگەڵ ئەوی تردا کە دراوسێیە.

لێرەوەیە دەتوانین بڕوانینەوە لەو حوکمە پۆڵایینە پڕ لە هەراوهوریایەی لە عیراقدا پیادە دەکرا، کە چۆن چۆنی بە یاسا و نەزمێکی نادادپەروەرانە و خاڵی لە هەموو ڕەوشتێکی مرۆیانە و شارستانییانە مامەڵەی لەگەڵ دەرودراوسێدا دەکرد و.. لە ناوەوەی خۆشیدا چ ماجەرایەک دەگوزەرا و چۆن ئاسایشی نەتەوە و چین و گرووپ و کەسێتییەکان بە نەبوونی دەسەڵاتی ئەقڵێکی کراوە و.. هەژموونگەری ئایدۆلۆژیای بەعس ڕژێنرابوون!؟

لە ناوەوە دانەنان بە شوناسەکانی تردا و.. نەبوونی پلۆڕاڵیەتی سیاسی و.. سڕینەوەی هەموو ئەو دەنگ و ڕەنگە جیاوازانەی دژ بەم ئەقڵییەتی دەسەڵاتخوازییە بوون. لە دەرەوەڕا هەڵگیرساندنی هەشت ساڵ جەنگ لە نێوان عیراق و ئێران.. ململانێی دوورودرێژی ئایدۆلۆژی ڕاست و چەپی بەعسییانەی عیراق و سووریا.. داگیرکردنی کوێت.. جگە لە غەدرە مەزهەبییەکان لە نێوان شیعە و سووننی و ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و سەرهەڵدانی وەهابییەت. واتە لەو سێگۆشەی بەرمۆدایەدا لە نێوان تەڕاتێن و شەڕی ئەو فیلانەدا، کورد بەو گژوگیایانە دەچوو، کە تەنها دەبوو هەوڵ بدات بمێنێتەوە و نەفلیقێتەوە و هەلاهەلا نەبێت و.. دەبوو بەو لاڵە پەتەییەی خۆشمانەوە کە هەمووی بێدەنگی بوو دەست بە شوناسی خۆشمانەوە بگرین لە نێو شانۆی دنیایەکدا کە هەمووی دەنگە دەنگ بوو!

لە کاتێکدا ئێمەی کرێچی و بێ ماڵ (بە دیدی ئەوان) لەسەر خاک و مێژووی ئەو دراوسێ نەخۆش و شەڕەنگێزانە، دەشێ حاڵمان چۆن بووبێت و دەبێت؟

ئەوان لە شەڕەکانی یەکتردا سەرکەوتوو بوونایە.. بەرزە دەماغی و گومڕاییەکەیان لەسەر جەستەی ئێمەش تاقی دەکردەوە. نوشوستیشیان بهێنایە ئەو تێکشکانە دەروونییەیان لە ئێمەدا بەتاڵ دەکردەوە و تۆڵەیان لێ دەکردینەوە. خۆ



ئەگەر لێشمان نزیک کەوتنایەتەوە هەریەک بۆ مەرامێک بوو.. هەتا دراوسێکەی تری پێ بخاتە تاڵووکەوە و ملکەچی عوقدە سیاسی و فیکری و مێژووییەکانی خۆی بکات. خۆ ئەگەر ئێمەش بمانویستبا سوود لە کەلێن و درز و کەلەبەرەکانیان ببینین.. هەموو ئێمەیان بە سیخوڕ و گومانلێکراوی وڵاتەکەی دراوسێی دەزانی و دەدایە قەڵەم. بۆیە ئەنفال لەو ڕووبەرە ناتەندروستەدا ڕووداوێک نەبوو بە ڕێکەوت و لە خۆوە و یان لە داڵغەی سەرکردەیەکەوە هاتبێت و ڕووی دابێت. بەڵکو سەرەنجامی ئەو هۆیە ئاینی و سیاسی و مێژووییانە و قبووڵنەکردنی شەریکە بەشێک بوو کە بیریان لەگەڵدا بکاتەوە و لە فیکری ڕێگەچارەیەکدا بن. بەڵکو ئەو شۆڤێنییەتەیان وەها نابینای کردبوون تەنها گوێیان لە دەنگی خۆیان دەگرت و هەڵوەدا بوو بوون بە دوای ڕێگەچارەیەکدا کە بۆ ئەبەد نەک کورد بێدەنگ بکەن بەڵکو واوەتر چووبوون و لە فیکری ئەوەدابوون بە یەکجارەکی لە ڕەگەزی کورد ڕزگارییان بێت و.. لە هەمان کاتدا نیشاندانی گەردن کلۆفتی و پێشڕەوایەتییەکیش بوو بەو وڵاتانەی دراوسێ کە هەمان کێشەیان هەیە بەدەست کورد و کەمایەتییەکانیانەوە.

لەبەرئەوەی کورد مێژوویەکی دوورودرێژ بەم هەموو پەتایانەوە لەگەڵ نەتەوەی سەردەستی دەنگ هەڵبڕ بەیەکەوە بووین، نەمانتوانیوە و ناتوانین هێند بە ئاسانی خۆمان لە نەخۆشییەکانی ئەوان بپارێزین و ببوێرین.لایەنی کەم لەبەرئەوەی ئەوان بە قۆناغی دەوڵەتبووندا گوزەرابوون، بۆ ئێمە فەرهەنگێکی باڵاتربوون و هیچیان لە ئێمەدا دروست نەکردبێ گرێی خۆ بەکەم زانینیان لە ئێمەدا چاندووە و بە جێهێشتووە. ئەوەشی ئەو گرێیەی هەبێت، بێ زمانە و هەمیشە بێ دەنگە و ناتوانێت خۆی وەک خۆی ببینێت و بدوێنێت و بە دەنگی بەرزیش لە خۆی بدوێت. کەواتە هەر ئایدۆلۆژیایەکی دینی یان سیاسی خۆی بەیەکەم دەنگ و دوا دەنگی حەقیقەت ببینێ و وێنا بکات ئەم کارەساتانەی لێ ڕەچاو دەکرێت، فاشییەت.. نازییەت.. سۆسیالیزمیش لەو مۆدێلانەن. دەسەڵات و ئۆپۆزیسیۆنە ناسیۆنالیستی و کۆمۆنیستی و مەزهەبییەکانی لەمەڕ خۆشمان، خۆیان لەو خومخانە مەعریفییە سیاسی و فیکرییە هەڵکێشاوە. بۆیە ناتوانن جگە لە خۆیان هیچ مەیلێکی تریان قبووڵ بێت!

دەرهەق بە وڵاتانی ئەوروپیش ئەوان دەزگا ڕەسمییەکانیان لە ڕێگەی دوو دۆکۆمێنتەوە ئێمەیان بینیوە و دەبینن. وڵاتانی سێگۆشەی بەرمۆدا لە بری ئێمە ئاخفیون و شوناسەکەمان ئەوە بووە کە چاوی ئەوان بینیویەتی و زمانی ئەوان گوتوویانە و میتۆدی ئەوان سەلماندوویانە. چونکە بەپێی ڕێکەوتننامە نێو دەوڵەتییەکان ئێمە سەر بەو وڵاتانەین و.. ئەمەش خەڵات و دەست و دیاری کۆڵۆنیالیستەکان خۆیان بوون بۆمان مایەوە و گومرگەکەی شەرحی قوربانی بدەیتە دەست جەللادەکەی چی دەردەچێت؟

دۆکۆمێنتەکەی تریش لەلایەن ئۆرینتاڵیستەکانەوە (ڕۆژهەڵاتناسەکان) بووە، کە خۆیان سەر بە دەزگا ڕەسمییە کلێشەبازە بیرۆکراتەکانی ئەوروپا خۆی بوون، کە وێنەی سەرپێیی و ڕووکەشییانە و تێکدراوی ئێمە بوون. کەوابێ ئێمەی سەرکۆنەکراو، کەوتووینەتە ژێر کۆمەڵێک بێدەنگی چین بە چینی کۆن و تازەی کەڵەکەکراوەوە.

بەپێی هەرەمی سیاسی نێودەوڵەتیش ئەم وڵاتانەی سێگۆشەی بەرمۆدا بەپێی بۆچوونی سەمیر ئەمین لە پەڕاوێزی وڵاتانی پەڕاوێز بووی سەنتەردان.. ئەمەش عوقدەی بچووکبوونەوە و خۆ بە کەم زانینی تیا بەجێ هێشتوون. کوردیش دەبێ بە پەڕاوێزی پەڕاوێز کەوتووەکان. واتە دەنگێک لە کورد بێتە دەرەوە بە کۆمەڵێ تەرجومە و فیلتەری سیاسی و دیبلۆماسی و کولتووری و ئەخلاقی عوقدەدارەکاندا دەڕوات و ئینجا دەگاتە دەست دەسەڵاتە جیاوازەکانی ئەوروپی!

گرفتێکی تریش ئەوەیە کورد لە نێو بنیاتی کۆمەڵایەتی و ئابووری خۆیدا فۆرمی وەرنەگرتووە و بە درێژایی مێژوویەک چەپێنراوە، بۆیە خۆی بە لاساییکەرەوەی نەتەوەی سەردەست دەزانێ و زانیوە. بگرە بە ئاگایی یا نائاگایی هەڵگری ڕەوشەکانی ئەویشە و لە زۆر بواردا هەروەک ئەو ڕەفتار دەکاتەوە. ئەگەر ئەو ڕژێمانە کوردیان بێدەنگ دەکرد بە هەر هۆیەک بێت کە هەندێکیمان خستە ڕوو.. هەنووکە کورد وەفادارە بەم حیکمەتی دەسەڵاتدارییە و خۆی خۆی بێدەنگ دەکات. بۆیە سەیر نییە کە سەرکردەیەکی کورد دەرهەق بە دیسپلین.. لە دانیشتنێکدا گوتبێتی: «سەرکردە دەبێت وەک سەدام حوسێن بێت». وە کورد ئەو ساتەوەختە



دەتوانێ لە جیهانە داخراوەکەی ئەوان دەرباز بێت. کە زمانی لێ سەندراوی هەر چین و توێژ و گرووپێک بگێڕێتەوە بۆ ناو دەمی خۆی و بە گفتوگۆ و دانووساندن و بەیەکتر سەلماندن و دەنگدان و دەستا و دەستکردنی وردە دەسەڵاتەکان خۆی ئاوەڵا بکاتەوە. ئەمەش ئارەزوویەک نییە.. هێندەی ناسینی ئەو فرە میتۆدییەیە کە مەیلە جیاوازەکانی کۆمەڵی پێ دەناسرێ و پێ دەخوێنرێتەوە و.. دەستنیشانی جێگە و ڕێگەیان دەکات و لە ڕێی حوکمەتێکەوە کە بە یەکێتییەکی ئارەزوومەندانە، بەپێی دەستوورێک کە گوزارشت لە کۆی بەرژەوەندییە ناکۆکەکان دەکات پێکهاتووە. لەو کاتەدا حوکمەت شتێک نابێ جگە لە ئیدارەی ئەو بەرژەوەندییە جیاوازانە. کە لایەنگرییان ناکا و دژیشیان ناوەستێت و هەموویان بە خۆی دەزانێت و سەروەرییەکەی تەنها لە هەوڵی ئەوەدایە چۆن چۆنی ئیدارەیان بدات. کە ئەم پرۆسێسە غایب بوو.. چاوەڕێ کراوە سەرکردەیەک بێت و لە ڕێی میدیای حیزبەکەیەوە ڕاشکاوانە بڵێت «هەتا ئەندازیارێکی حیزبی وەستابێت، کار فەراهەم نییە بۆ ئەندازیارێکی غەیرە حیزبی». داخوا ئەم جیاوازی کردنەی مافی هاووڵاتیان بە پێوانە حیزبییەکان، هەمان فەرهەنگی بەعس نییە بە میرات ماوەتەوە و درێژبووەتەوە بۆ نێو فەرهەنگی سیاسی ئێمەش؟ ئەگەر ئەمە وەفاداری ئێمە بێت و هەموو نەتەوە کورت بکەینەوە بۆ نێو حیزب، کە دەنگی ڕاستەقینەی نەتەوەیە. کەواتە دەنگەکانی دەرەوەی حیزب دەنگی گومانلێکراو و زۆڵ دەردەچن. ئەمە دەلیلی نەبوونی یاسا و ڕێسایەکە کە هاوسەنگییەک لە نێو مەیلە جیاوازەکاندا پێک بهێنێت و هیچ دەسەڵاتێک لە سەروو یاساوە نەبێت. بەڵام یاساکانی لای ئێمە غولامی ڕەهبەرە سیاسەتبازە عوقدەدارەکانمانن و ئێمەش ڕادەهێننەوە لەسەر توندوتیژی و ژاوەژاو و نەخۆشییەکان بۆ یەکتر دەستاودەست پێ دەکەین و گیانی نیشتمانپەروەری دەبێتە نوکتەی خۆش.

ئایا ئەمەش دیسان ڕاهێنانەوەمان نییە لەسەر دەستبەسەرداگرتن و بێدەنگکردنێکی تر؟ چ کەسێکی هۆشیار و دەروون سەرفیراز ئەتوانێ بڕوا بە دەسەڵاتێک بکات و چاوەڕوانی لێی هەبێت، کە هاووڵاتیبوون لە ڕوانگەی پێڕەوی ناوخۆی حیزبەکەیەوە تێدەگات و دەبینێ و بە شکۆدارییەوە مافی حیزبییەک دەدا

بەسەر ناحیزبییەکدا و باس لە کەرامەت و ئاسایشی نەتەوەش دەکات. دەسەڵاتێک ئاوها گومڕایانە بدوێت، سەیر نییە هەموو شتێک قۆرخ بکات بۆ خۆی و لەززەت لە زرنگاندنەوەی دەنگی خۆی و لە کڕبوون و بێدەنگکردنی غەیرە حیزبییەکان ببینێت! ئەمەش پێمان دەڵێت: شەڕی ئێمە لەگەڵ ڕژێمەکاندا بۆ دابەشکردنی دەسەڵاتی حیزبی بووە.. نەک بۆ گێڕانەوەی ئەو دەنگانەی لێمان زەوت کرابوو.

کە داخواز و چاو لەدووی جێگیرکردنی مۆڕاڵ و بەهاگەلێکی ئینسانیبوون کە جێگەی حەوانەوە و تەبایی هەموو مەیلە جوداکانی کۆمەڵگە بێت وەکو یەک.

**– ئەو هۆکارانە چین کە ئەنفال لە هۆشیارییەکی سیاسی سادەوە کە تەنها لە یاد کردنەوەی سەرپێیانەی ساڵانەدا قەتیس بووە، دەگوازێتەوە بۆ هۆشیارییەکی کولتووری، لەو بێدەنگییەی کە خاوەنی قسە نییە دەگوازێتەوە بۆ بیرکردنەوەیەک بە دەنگی بەرز. هەروەها ئەم بێدەنگییە چەند پەیوەندی بە کورد خۆیەوە هەیە، هەم لە ئاستی بەرپرسیارییەتی کۆمەڵگەی کوردی بۆ ئەنفال و هەم لە ئاستی دەستەڵاتی کوردی خۆیدا.**

– بەشێوەیەک بۆمان ڕۆشن بووەوە یادەوەری کورد، یادەوەرییەکی بێدەنگ کراوە.. کەس و گرووپی بێدەنگ کراویش لەگەڵ هەر فرسەتێکدا کە بۆنی ئازادبوونی لێ بێت، یەکەم کاردانەوەی بە شڵەژان و بێ سەروبەرەیی و ژاوەژاو دەست پێ دەکات و دەردەکەوێ. بۆ خاتری ئەوەی وەڵام بەو بێدەنگکردنە دووروودرێژە بداتەوە کە لە پشتیەوەیەتی و جڵەوکێشی کردووە.. بەڵام نازانێ چۆن! هاوار دەکات بژی.. بڕووخێ. بەڵام ناتوانێ بە قووڵی بیربکاتەوە دەربارەی ئەو شتەی بەیانی دەکات.

جنێو دەدات بەڵام خەون بە ئەخلاقی بەرزی شۆڕشگێڕانەشەوە دەبینێت جارێک دەبێتە ئۆپۆزیسیۆن و لە داخی ئەوەی دەسەڵات لە ئاستیدا کەم کار و خەمسارده و نابینای دەگرێت ئەمیش تەڕو وشک دەسووتێنێت و ئەمەش بە ڕادیکالییەت تێدەگات. جارێک هەموو شتێکی قبووڵە و دەڵێت: باوکم کۆمەڵێکی دواکەوتووی وەک ئێمە هەروا دەبێت و ئافەرم بۆ ئەو کەسەی سوود لەم فرسەتە دەبینێت. جارێک هەموو شتێکی ڕەفزە و گەرەکیەتی هەموو شتیک بۆنی بێ گوناهی و پاکیزەیی لێ بێت.



جارێک پێدەکەنێ بە مێژووی کۆشش و خەباتی خۆی و.. جارێک گاڵتەی بە هەموو شتێک دێت. یان دڵی بە هەموو شتێک خۆشە و ئالوودەی تێکەڵیوپێکەڵییەکی سەیر دەبێت!

تێکەڵەوپێکەڵە، چونکە هیچ شتێک ڕێک نەخراوە و بە ئۆرگانیزە بووندا نە گوزەراوە، تەنها ڕێکخراو بوونی حیزبی نەبێت بە دەوری ئایدۆلۆژییەتێکدا. ڕێکخراو بوونیش بە پلەی یەکەم، هێزی خۆی ئامانجەکەیەتی.. نەک مرۆڤ. مرۆڤبوون بە هەموو ڕەهەندی ئازادی و مافەکانییەوە بەپێودانگەکانی خۆی دەپێوێ و بەگەڕدەخا و لابەلا دەکاتەوە.

ئەو شەڕانەشی حیزب بەرپایان دەکات، لە دواجاردا هیچ نین جگە لە سەپاندن و فەرزکردنی ئەو بڕوایانەی ئاینامەی کارکردن و جیهانبینییەکەین. چونکە هەر حیزبێک جەماوەریبوون و پێشڕەوایەتییەکەی هەرچییەک بن، ناتوانێت تانوپۆ و دەنگ و ڕەنگی هەموو نەتەوە بێت بە گشت گرووپ و وردە کولتوورەکانییەوە.

جا ئەگەر چەمکی کولتووریش لە سادەترین پێدراوەکانیدا : (چەند گرووپێک لە خەڵک بەیەکەوە دەبەستێتەوە و یەکیان دەخات و بیروباوەڕ، ترادیسیۆن، دابونەریت، بەها و فێربوونەکان دەگرێتەخۆ. جەوهەری تایبەتی خۆی لەسەر کەسایەتی ئەو مرۆڤانەی پەیوەستن پێیەوە وێنا دەکات... تاد) ئەگەر ئەم بنەمایە نەبوو هەر بنەماڵە و گرووپە بەپێی باڵادەستی و هێزی ئابووری و سیاسی و سەربازی خۆی لە هەوڵی ئەوەدایە گرووپەکانی تر مەسخ و ڕەنگڕێژ بکات.

بۆ نموونە مرۆڤناسی ئەمەریکی– ڕاس بێندێکت– لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا، کولتوورەکانی دابەش کردووە بۆ دوو جۆری «فەلسەفی» و «پاڵەوانی». لە ناو کولتووری فەلسەفیدا.. حاڵەتەکانی وەکو قەناعەت، ئاشتیخوازی، میانڕەوی و یەکسانی و ئارەزوو بۆ ژیانی هاوبەش، بە ئاشکرا زاڵە.

لە کاتێکدا لە ناو کولتووری پاڵەوانیدا ڕەفتارەکان پشت بە شەڕخوازی، ناکۆکی و بەربەرەکانی، ململانێ، سەربەخۆییخوازی و پلەوپایەخوازی دەبەستن. ئەزموونەکان لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پیشانی داوین کە کولتووری پاڵەوانبازێتی زمانحاڵی زۆربەی ئەو گرووپانەیە کە دەسەڵاتیان بە دەستەوە بووە و

هەیە. کوردستانیش دەکەوێتە ئەو خشتەیەوە و جەنگاوەرێک زۆر بەڕێزتر و بە شکۆتر و بە بەهاترە لە ڕۆشنبیرێک و هونەرمەندێک و ڕۆژنامەنووسێک.

لە کاتێکدا بەپێی سیستەمی کولتووری، بەرهەمهێنەرانی کولتوور.. واتە: نووسەران، هونەرمەندان، شاعیران، دەرهێنەران، لە ناوەڕاستی سیستەمی کولتووریدان.

کەچی لە فەرهەنگی باڵادەستکراوی ئێمەدا.. لێپرسراوی سیاسی وا هەیە بە ئیفتیخارێکەوە گوتوویەتی: کام شاعیرە زۆر بە ناوبانگە بە چارەکێ عارەق هەڵیدەپەڕێنم! مەئەساتەکە لێرەدایە هەموو بنەماکان قلْپ کراونەتەوە و.. ئەوەی ئەندێشە و روئیا و هزر لە مەیدانی کولتووریدا دەجووڵێنن و دەسازێنن سیاسەتبازەکانن. سیاسەتبازێتیش لای ئێمە هەموو مۆڕاڵی کۆمەڵگە لە کلێشەی ئایدۆلۆژییەتەکەیەوە هەڵدەهێنجێ و سەراپا جومگە هەستیارەکانی کۆنترۆڵ کردووە هەر لە دامەزراوە کولتوورییەکان و دیاردە کولتوورییەکانەوە هەتا مەرامە کولتوورییەکانیش.

ئەم نمایشە کورتەم بە خاتری ئەوە نیشان دا هەتا پلە بە پلە ڕێگەیەک بکەمەوە بۆ چوونە سەر ڕەگی پرسیارەکەی بەڕێزتان، بۆ تێگەیشتن و ڕۆشنبوونەوەی ئەو گرفتانەی کە بۆچی ئەنفال لە هۆشیارییەکی سیاسی سادەوە ناگوازرێتەوە بۆ هۆشیارییەکی کولتووری! لەبەرئەوەی بنیات و هەیبەتی کولتوور بچووک کراوەتەوە و ئاخنراوەتە بەرنامەی حیزبەکانەوە و خاوەن حیزبەکانیش خاوەنی هەموو شتێکن!

هەنووکە ئەوە قوتابخانە فیکرییەکان نین ڕێنوێنیمان دەکەن کە ئایدۆلۆژیا و باوەڕپێهێنراوەکان و بەها کۆمەڵایەتییەکان و کار و ژیانمان بپشکنین و بەپێی هەلومەرجەکان خوێندنەوەی تازەیان بۆ بکرێت و گەشەیان پێ بدرێ و ئاراستەی تر وەربگرن. بەڵکو ئەوە دەزگا حیزبییەکانن بەهای هەر شتێک دەردەخەن و ڕەفتار و نۆرمی جۆراوجۆری پێ دەدەن و نەتەوە بە دەوری سەرۆک و دروشمەکانی خۆیاندا کێش و باوەخولێ پێ دەکەن. حیزبیش وەک هەر گرووپێکی تر لە سایەی ڕژێمە دیسپۆتیستەکانی پێش خۆیدا خۆی بە قوربانی یەکەم دەبینێ و.. کۆمەڵگە بە هەموو شێوە جیاجیاکانی چەوساندنەوە و چەپێنراوەکانییەوە لەسەر خۆی ناونووس دەکا و



سیستەمی بۆری ئاو و کارەبا و جادە و بانی بۆ چارەسەر ناکرێت، کەچی سیستەم بۆ نووسین و تێکستی نووسەران و ڕۆژنامەنووسان و بیرکەرەوەکان دادەمەزرێنێت و مەرزی ئەخلاقەکانمان بۆ دەکێشێت.

لەو بارودۆخەدا کە غیابی ئەخلاق و خەون و بیرکردنەوەیەکی ئینسانییانەیە هەر گرووپەی دەخوازێ وەڵامی یەکەمین بە مەحروومییەتەکانی خۆی بداتەوە و.. ئاگر بۆ کوورەکەی خۆی بدزێت. ئەمەش ئەو ژاوەژاو و گەڕە لاوژەیە بەرهەم دەهێنێ کە ئاماژەمان پێ کرد. بۆ ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی ئەو کێشانەش.. دەشێ دەستوورێک هەبێت کە ماف و ئەرکەکان سکۆلارییانە و پتەو بەشێوەیەکی دادپەروەرانە لە بەرامبەر یەکتریدا و بەیەکەوە لە خۆ بگرێت و بەپێی پەیمانێکی کۆمەڵایەتی دەسەڵاتەکان لە فەوزاوە بگۆڕێت بە سیستەم.

داخۆ ئەم کارانە بە هۆی هەژموونی حیزبەکانەوە ڕەخساون و دەڕەخسێنرێن..؟ پانێڵێکی ئاوهامان هەیە کە کۆدەنگی هەموو دەنگ دەرهاتووەکان و دەزگا و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان بێت بێ گۆتکردن و سڕینەوەیان؟ یاخود حیزب ئەختەبووتێکە و پەلی هاویشتووە بۆ نێو هەموو کایە کۆمەڵایەتییە جیاجیاکان و لە بری هەموویان بیردەکاتەوە و دەئاخڤێ و بڕیار دەدات و ئەمەش بەئەرکی مێژووکردی خۆی دەزانێ و ئێمە بەس لەسەرمانە ببیستین و پێڕەوی لەو فەرمایشتانە بکەین هەتا نان بڕاو نەبین و تڕۆمان نەکەن!؟ هەرکاتێ حیزب لە ئەماندا بوو ئەوە جەماوەر لە بەخششەکان بێخەبەرە و.. ئەگەر لە تەنگژەشدا بوو، دەم و دەست هاوار بۆ نەتەوە دەبرێتەوە و جەماوەر تاجی سەر و سەروەرە.

بە کورتی و کوردی ئێمە لە گیرفانی کولتوور و مەعریفەی تاکڕەهەندانەی سیاسی ناوچەکە هاتووینەتە دەرێ و قولانجێک نەچووینەتە ئەولاوە و ناشمانەوێ بچینە ئەولاوە. بەڵگەنامەکانیش پێمان دەڵێن: ئەم لەوەڕی دەسەڵاتدارێتییە بۆ درێژەدان بە خۆی ئەم دەبڵ فەیسی «دووڕوویی سیاسی» دەخوازێ و- دەکارین بە دیبلۆماسییەت ناوزەدی بکەین. چونکە دەسەڵاتدارێتی لە ڕۆژهەڵاتدا ئەمەی پێویستە و نامانەوێ پلەوپایەمان بە هەندێ فەنتازیا و خەونی شاعیرانە لە دەست بچێ و بچین- (ئەمە زەمزەمەی سیاسەتبازەکانی فەرهەنگی سیاسییانەی لای ئێمەن).

هاوڕێی ئازیز.. پێشچوون بە خۆزگە و هوتافات و بانگەشە نایەتە دی، بەڵکو میکانیزمی خۆی هەیە و دامەزراوی کۆمەڵایەتی وردە کولتوورە پیشەییەکان.. ئەتنیکییەکان.. ئاینییەکان.. ناوچەییەکان.. لادێنشینەکان... تاد ڕۆڵیان هەبێت لە زیندوو ڕاگرتنی بەهاکانی خۆیاندا و لە ڕێگەی کارلێکی کۆمەڵایەتی و سیاسییانەدا لە چوارچێوەی نەتەوەدا بە هاوبەشی بژین و درشتە کولتووری نەتەوە بە ڕەنگ و ڕووی تایبەتییەتی وردە کولتوورەکانی خۆیان ببینن و بزانن.

ئا لەو ئاوێتەبوونە ئارەزوومەندانەدایە هەرسێ چەمکی (کۆمەڵگە و کولتوور و کەسێتی) لە لای- ڕالف لینتۆن- جیاکردنەوەیان لە لای تۆژەرەکان بە زەحمەت دەزانرێت.

کەچی جینۆسایدی ئەنفال کە زیاتر لادێنشینەکانی گرتەوە، لە لایەن وردە کولتوورەکانی شارەوە، نە هەستیان پێ کراوە.. نە بیریان لێ کردۆتەوە. لەبەرئەوەی لادێنشینەکان دەنگی ڕاستەقینەی خۆیان بزرە و لە لایەن حیزبەکانیشەوە تەنها بووە بە کەرەستەی بانگەشە و بێ خەیاڵن لە چەرمەسەری و میحنەتەکانیان. ئەوەتا یەکێک لە سەرکردەکان بە دڵنیاییەوە دەرهەق بە ئەنفالکراوەکان لە چاوپێکەوتنێکدا دەڵێت: (وەختی خۆی کە ئیدارەی هاوبەش هەبوو لە نێوان یەکێتی و پارتیدا و پەرلەمان دروست بوو، بڕیار بوو لەو بارەیەوە شتێک بکەن و ڕایبگەیێنن کە ئەوانە نەماون بۆ ئەوەی چارەنووسیان مەعلوم بێت بەڵام دوایی دواکەوت.. بۆچی دواکەوت نازانم؟ بە ڕاستی دەبوو زۆر زوو بکرایە، چونکە ئەمە مەسەلەیەکی قانوونی و مەسەلەیەکی شەرعی زۆر زۆر ناسکە!!)

ئەی سەرکردەی واقیعبین و دووربین! ئەگەر تۆ نەزانی بۆچی دواکەوتووە و لە هەمان کاتدا مەسەلەیەکی قانوونی و شەرعی زۆر زۆر ناسکیشە. ئەی کێ دەیزانی لەودیو دەرگاکانەوە چی دەگوزەرا.. لە بەرامبەر چاوەڕوانی بێهوودانەی چەندین ئافرەت کە شوویان نەکردۆتەوە و لە ڕووی دەروونی و کۆمەڵایەتی و عاتیفییەوە کێ لێپرسراوە.. داخوا نمایندەی ئەو خەڵکە کارەستبارەتان لابوو و مۆڵەتتان پێ دان هەتا بە زمانی خۆیان بدوێن و گوزارشت لە خۆیان و ڕێگەچارەیەک بکەنەوە دوور لە تەفسیراتی ئێوە؟!



ئایا ئەمە فەرامۆشکردن نییە و ناگەیێنێت.. بە مانا ئۆنتۆلۆژی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکەی؟ ئایا ئەم بێدەنگی و بێدەنگکردنە ڕۆنەچووە بە مۆخماندا و نەبووە بە بەشێک لە کولتووری سیاسیمان؟ هەموو بە جۆرێک لە جۆرەکان تاوانبار نین، دەرهەق بە نیوە تیرۆرکراوەکەی لەشی خۆمان. لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە ئەمە مومارەسە کردنی جۆرێک لە ماسۆشییەت نییە.. لە بەرامبەر دوژمندا و بێداربوونەوەی سادییەتیش نییە لە بەرامبەر یەکتریدا و خەمسارد لە بەرامبەر خانە مرێنراوەکانی جەستەی نەتەوەدا؟ ئاخۆ لە نێو ئەو بێ سەروبەرییە سیاسی و کولتوورییەدا بە- مانا کۆمەڵناسییەکەی- وە کۆنترۆڵکردنی هەموو جومگەکانی کۆمەڵدا چۆن کارەساتی ئەنفال دەگوێزرێتەوە بۆ هۆشیارییەکی کولتووری؟

لە بری ئەوەی کولتوور زەمینەیەکی وەها بسازێنێت کە خود لەگەڵ خۆی و ئەوانی تردا ئاشت بکاتەوە و تاکەکانی کۆمەڵایەتی بکاتەوە و.. بە ئیرادەیەکی چاوساغانەوە نە کوێرکراوەوە پێویستییەکانی بناسێتەوە و هەڵبژێرێ. دێین و بە حیزبیان دەکەین و لە مەنگەنەی ئایدۆلۆژییایان دەدەین و ناهێڵین خاوەنی خودی خۆیان بن. نەبادا بەیانی لێمان قیت ببنەوە و چەقوەسووانە زماندرێژی بکەن و بە کاڵفامی خۆیان یاخی ببن!؟

پێم وایە ڕێکخستنی مەدەنییانەی خەڵک بە موگناتیسێک دەچێت، کە لێی درا و فڕێ درایە ئاگرەوە.. خەسڵەتی موگناتیسییانەی خۆی ون دەکات و لە دەست دەدات، بۆ ئەوەی خۆی ڕێک بخاتەوە دەبێ ئەو ئاسنە کە پێشووتر موگناتیس بووە لە موگناتیسێکی تر بخشێنرێتەوە هەتا ئاراستە تێکچووەکانی خۆی دابمەزرێنێتەوە.

لێرەدا بنۆڕە حاڵی فێرکردن و پەروەردە لە ڕووی پێکهاتە و شێواز و مەنهەجییەتەوە لە جاران داوەشاوتر نەبێت، باشتر نییە. بنۆڕە بە فەرمانی فلان سەرکردە قوتابخانە دەکرێتەوە.. خەستەخانە دادەمەزرێ.. خەڵک دەنێردرێت بۆ دەرەوەی وڵات، بناغەی کۆمپانیا دادەڕێژن، ئەی وەزارەتە پسپۆرەکانمان کاریان چییە و بۆچی دانراون؟

بە بەرچاوانەیە و مەتەڵ نییە، بەهاکانیش لە نێو پەسەندی ڕەنگە حیزبییەکاندا کفن و دفن کراون و.. چاودێری کۆمەڵایەتی.. دابونەریت و نۆرمەکان..

بیروباوەڕەکان.. سیستەمی ژیانی خێزانی، قاڵبەکانی قەزا و قەدەر و دەستی ئاسنین دەیانبات بەڕێوە و لەجیاتی زمان پژان بە ئەگەرە تاقینەکراوەکانی خۆی.. بە تێروتەسەلی بە زمانێکی دووبارە بووەوە لاڵمان دەکەن.

دەسەڵات.. لە کولتوور هیچی ناوێت، تەنها ئەو ئەخلاقە بەرزەی لێی دەوێت، (بە ئەندامی خێزان و قوتابخانە و مزگەوت و دامەزراو و دەزگاکان بقەبڵێنێت، ئەوەت بوێت کە من حیزب- بە باشی دەزانم بۆت و کرێ بە!) چونکە ئێمە پێشڕەوایەتیتان دەکەین. ئیتر ئەوە ئەخلاقی سیاسییانەی ڕۆژهەڵاتە و ئاوا براوە و دەڕوات بەڕێوە. بەڵێ کۆمەڵایەتیبوونەوەش لە دوا شرۆڤەدا یەعنی وابەستە، بە حیزبیبوونەوەی ئارەزووە بەردەوامە هاوبەشەکانتان، لەمە زیاتر بترازێت ئاسایشی نەتەوە دەکەوێتە مەترسییەوە! چونکە پەیوەندی، هێز، بیروباوەڕ، هەست و سۆزی نەتەوەیی، یەعنی بالادەستی حیزبیبوون!! ئەم کرمەڕێزبوونەش بە جیاوازی فۆرمالیستانەی ناسیۆنالیست و ئیسلامی و سۆسیالیستییەکان لە جەوهەردا لە ڕووی فیکرییەوە یەک شتن و هەریەک پێی وایە خۆی نمایندەی حەقیقەتە بۆ چین و نەتەوە و لە دوورنماکانی ئەوان زیاتر هەموو بزووتنەوەیەکی تر گومان لێکراوە.

لە نائاگایی سیاسی و ئایدۆلۆژی هەموویاندا کار دەکات و لێیان دەخورێ و ئەوانیش خەڵکی مێگەل ئاسا لێ دەخورن.

لە زمانی هەموویانەوە، لەم ڕاستییە مێژووییە بترازێ ژێدەری هەموو توێژینەوەیەک ئاژاوەچێتییە.. دووربینییەکیش گەر هەبێت جۆرێکە لە گێرەشێوێنی منالانە و بەتاڵە. ئێمە چەندین ساڵە خۆبەخشانە بە شاخەوە بووین کۆمەڵگەی (کۆمەڵە گای) خۆمان بە هەست و پێستەوە باش دەناسین.

هێشتا لە سەرەتاداین، خۆ ئێمە ئەوروپا نین.. بۆیە دەزانین لە چ کۆلانێکدا ئازادی پێ دەدەین و لە چ شەقامێکدا لێی دەسێنینەوە. فێری ئەوەیان دەکەین ڕۆڵ و سنوور و بەکارهێنانیان بە چ شێوەیەک دروستە و دەڕوات بەڕێوە بە خزمەتی چینی کرێکار و.. نەتەوەی کورد و.. ئوممەتی ئیمانداری ئیسلام.

ئێمەش هەر ئەوەمان بۆ دەمێنێتەوە وەکو جاری جاران بە دوای دروشمەکانیاندا ببۆڕێنینەوە «هەلهۆلە لیلحیزب صامد»



کولتووری ولاتە کراوەکان کولتووری بیستن نییە بە تەنها، بەڵکو کولتووری ئازادی بینین و گفتوگۆ و سەلماندنیشە. هەتا بە بێ شەرم و ترس و تۆقاندن. دەنگ هەڵببڕێت و بتوانرێت نهێنییەکان بپشکنن و هەڵکۆڵن و لە ڕاستی و دروستییان بەشێوەیەک لە شێوەکان دڵنیا بن و شتەکانی ئاین بدەنەوە بە ئاین و حیزب بدەنەوە بە حیزب و پەروەردە بدەنەوە بە پەروەردە و حکوومەت و دامەزراوەکان بدەنەوە بە خۆیان، بەپێی پەیمانێکی کۆمەڵایەتی. بۆ ئەوەی بەریەککەوتن ڕوونەدات.. خۆ ئەگەر ڕووشی دا کەمتر بێت و چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە. وەکو ترافیک لایت دەبێ نیشانەکانی هاتوچۆ هەبن و بایەخەکانی بخرێتە ڕوو. ئەگەر سێگۆشە هەبوو لە لای تۆوە، هەقی ئەوی ترە بڕوات. کە نووسرا بوو ستۆپ هێواشی ناکەیتەوە بەڵکو دەبێت بووەستیت.. تاد.

تۆ بڕوانە لە ولاتە پێشکەوتووەکان.. لە سیستەمی ڕێگەوبانیانەوە دەبینیت و تێدەگەیت سیاسەت لەو ولاتەدا چۆن بەشێوەیەکی ناچۆڕاڵی دەڕوات بەڕێوە و لە هەولی ئەوەدان چۆن ماشێنەکان هاتوچۆ دەکەن؛ تاک و گرووپ و چین و توێژەکانیش دەچن بەڕێوە و کەمترین بەریەککەوتن ڕوودەدات. لەمەوە هەرکاتێ سیستەمی ڕێگەوبان کە بە دەمار و مولوولەکانی جەستە دەچن چاکرانەوە، ئەوا تێدەگەین ئەو کۆمەڵە نزیک نەبووەتەوە لە سەکتەی دڵ و دەماغی کۆمەڵایەتی!

**- ئەو پێشنیارە تایبەتییانەی ئێوە چین. بۆ ئەوەی ئەنفال وەک کارەساتێکی سیاسی مێژوویی لە یادەوەری ئینسانی کورددا بە چەشنێک بمێنێتەوە کە هەمیشە جێی ئاوڕدانەوە و قسەکردن بێت لە سەری لە لایەن ئەو نەوانەی کە لە دوارۆژی کۆمەڵگەی ئێمەدان؟**

دەشێ نەوەی نوێ ئێستای خۆی بناسێت. ئەو ئەمێستایەی بە ژیان و بوون و خودێتی ئەو نامۆ و تەکولۆ نەبن و لەوێوە بچێتەوە سەر ئەو گرفت و کێشە و مەرگەساتانەی بەشێکی زۆریان لە یادەوەرییەکەی داگیر و داغان کردووە و پاشەڕۆژیشی لا نارۆشن و لا بەدبین دەکەن. ئەمەش هەر وا ئاسان نییە و ناچار دەبێت خۆی بۆ کۆمەڵێ جەنگ ئامادە بکات. یەکێک لەو ئەرکە بەراییانەش کە ئەو

جەنگە ئەقڵانییە پێویستێتی ئەوەیە.. تێبگات کۆمەڵ لەبن کەناری حیزبیەتدا، دەنگی دەرنایەت و بوونە ڕاستەقینەکەی شێوێنراوە، تەنها ڕێگەیەکی کاربڕ و نوێش ئەوەیە بەدوی ئەو ڕێگەیانەدا هەڵوەدا بێت.. کە ژیان و بوون و خودی ئینسانیانییەکەی بۆ بگێڕنەوە و چیتر لە نێو تەعریفە سواو و پواو و نەزۆکەکاندا نابووت و بێ مانا نەبن. ئەمەش نابێت ئەگەر دیسانەوە لە ناو ئەو شتانەدا چینە بکەین کە تەنها ئایدۆلۆژیا و دین پاوانی کردوون و هێز و وزەیان لە بنەماکانی ئەوانەوە وەرگرتووە و دونیای ئێمەیان پێ ڕێکخستووە و لێکداوەتەوە.

(ئەگەر دەخوازی هاوڕێیەتی فیلەوان بکەیت.. دەبێ ماڵێک دروست بکەیت، کە بۆ فیلیش شیاو بێت).

بۆیە ناچار دەبێت ماناکان و سروشتی نیشانەکانیان بگۆڕن بە فرە میتۆدییەکی زانستییانەی وەها کە وردبوونەوە و تێڕوانینێکی نوێیان پێ ببەخشێت کە لە توانایدا بێت.. هەموو پنتە پەراگەندە و نادیدە و جیاوازەکانی کۆمەڵ هاوئاهەنگ و هاوهیوا بچنە پێشەوە و، نوێنەرایەتی ڕۆحی سەردەمییانەی خۆیان بکەن و ئایدۆلۆژیا و ئاینیش لەو ڕۆحە کراوە و پەنگ نەخواردوو و جۆش سەندووەدا بە جۆرێکی تر بە خۆیان بگەنەوە و کۆتایی بە سنوور تەسکییەکانی شیکردنەوە و لێکدانەوە تاک ماناییەکانیان بهێنن و تێبگەیێنرێن ئێوەش دەتوانن هەر یەک مانا بن.. نەک هەموو ماناکان، یاخود باوکی هەموو ماناکان.

دەبێ بیروباوەڕەکان بە کۆتایی خۆیان بگەیێنرێن و جێ بۆ بیرکردنەوە بەردەوامەکان چۆڵ بکەن و بکەنەوە، بەو مانایەی خۆیان وەک یەکێک لە دەرکەوتەکانی بیرکردنەوە لە قۆناغێکدا ببینن و، وا مەزەنە نەکەن خۆیان بە سروشتی دوا بیرکردنەوەکان ببینن و بزانن.

چونکە وەستان لەو تەنگژە نائەقڵانییەدا ئەگەری زیاتر و دۆزینەوەی زیاتری خۆمان و ژیان و شارستانییەتمان لە بەردەمدا ون دەکەن و دەسڕنەوە و فۆتۆکۆپی ئەو دەسەڵاتە دیسپۆتیزمانەمان بۆ دەکەنەوە کە لە ڕۆژهەڵاتی ئاین و ئایدۆلۆژیادا مەرگەسات خوڵقێن بوون و دەبن بە هۆی ئەو ئەقڵە دوگماگەراییانەوە. تەنها تێبینییەک بیکەن ئەوەیە کە چۆن دەسەڵاتی سیاسییان لە کیس نەچێت جا کێشە



نییە با دونیا و ژیانیش وێران بێت و بسووتێت. بەڵێ کەنعان مەکییە باشی بۆ چووە.. کە دەوڵەتی بەعس دوای هەموو شکستێکیش پێی وابوو هەر سەرکەوتووە.. چونکە ئەو ئەقڵییەتە داخراو و تاکڕەهەند و تاک مانایە شەڕخوازە سەلامەتی حیزبەکەی خۆی لە سەروو هەموو نەتەوە و بوارەکانی تر دەبینی. چونکە ئەو جۆرە ئەقڵییەتانە نیشتمان و مێژوو و مرۆڤەکان و چارەنووسیان هەر بە خۆیان دەزانن بەڵام بێ ڕاوێژ و پرس بەوان. ئەمانە هیچ بەهایەکی ڕاستەقینە نابینن بۆ بەهاگەلێک کە لە دەرەوەی لۆژیکی سیاسی و ئایدۆلۆژی خۆیاندا هەبن. ئەم نەخۆشییە ئەقڵی و ئەخلاقی و وجودییە پەتایەکە و پێدزکەی کردۆتە ناو ئۆپۆزیسیۆنەکانی جارانی خۆشیەوە و، ئەمێستا دەسەڵاتەکانی خۆمان بەرە بەرە جارێک بە ئاشکرا و زیکزاکی و جارێک پەنامەکی لاسایی دەکەنەوە. هەر لە پەرستنی سەرۆکەکانمانەوە بە پاڵەوانی مێژوویی و.. هەر لە قبووڵنەکردنی یەکتری و.. هەر لە دامەزراندنی دەزگا و دامەزراو و سەندیکای کارتۆنی و ڕامکردن و دەستەمۆکردنی نووسەران و هەر لە بەرزکردنەوەی جەنگاوەرێکی حیزبی بۆ پلە باڵاکانی ئەفسەری و هەر لە بووژاندنەوەی عەشیرەتگەری و دیوەخانەکان و هەر لە خەمساردی لە بەرامبەر ئەتککردنی ئافرەتان و جوانییەکانی تر و... تاد.

لەم دۆخە ترسناکەدا کە بە ژێر پێستی کۆمەڵدا دەڕوات، کە ئێمە حورمەتمان نەبێت بۆ زیندووەکان.. دەشێ چ چاوەڕوانییەکمان هەبێت بۆ یادەوەری مردووەکانی ئەنفال و هەڵەبجە و گەلی بازێ و شێخ وەسانان و سێوسێنان و کوێ و کوێی تر؟ ئەوە نەبێت.. دەزگا و دامەزراوە بێ شوناسەکان لە ڕووی کۆمەڵناسییەوە..، کە تەنها ڕیشەیان دەچێتەوە سەر حیزبیەکانیان و هێرش و گەمارۆدانەکانیان بە داخوازی حیزبە و بۆ ڕاگرتنی هەیبەتی حیزب و وەزیفەکانێتی. ئیتر گرنگ نییە هەر شتێک بەم داخوازی و ڕاگرتنی هەیبەت و وەزیفەیەش ڕێگەکانی خۆی ون بکات. دروشمەکانی حیزب.. ئەرک و هەوڵ و کۆششەکانی حیزب.. گومان هەڵنەگرن و فەلسەفەی گونجاون بۆ بەرەو پێشبردنی نەتەوە و دەربازکردنی لە نێو تەنگانە و گۆشەگیرییەکانی خۆیدا و ڕێککردنەوەی ناڕێکییەکانیشێتی! ئەوەی لاری لەم میراتەی دەسەڵاتەکانی پێشووش هەیە و پێشبینی کەتن و کەوتنێکی تر و گرفت و مەترسی هەناوبڕ دەکات و خوێندنەوەی جیاوازتری هەیە بۆیان، گێرەشێوێنە..

هەرزەکاری سیاسییە.. شاعیرێکی فەنتازی دوور لە واقیعە.. هیچ لە باردا نەبوو و ترسنۆک و دۆڕاوە.. بەدبینە.. بە گوفتارە و بێ ڕەفتارە.. ئەنتی دەسەڵاتە.. فەوزەوییە.. بە کرێگیراوە.. سەفسەتەکەرە.. تابووری پێنجەمە... تاد

داخوا نەوەی نوێ بۆ ئەوەی لە نوێیەتی خۆی ڕازی بێت و بە بنچینەی بکات و.. بۆ ئەوەی تێک نەشکێتەوە لە نێو وەهمی ئایدۆلۆژییەتە گەوهەرتێکشاوەکاندا دەتوانێ بە قاڵب و کلێشەی تەفسیرە کۆنەکان لە نێو تەونە جاڵجاڵۆکەییەکانی ئەو هەراو زەنایە بە دامەزراوکراوانەی ئایدۆلۆژیا داماوەکاندا ڕێ دەرببا و بەشێوەیەکی تەندروست بە خودە ونبوو و لەدەستچووەکانی خۆی بگاتەوە و کەوتنەکانی تێبپەڕێنێت و بە ڕۆحێکی سەرفیرازەوە بڵێت: چیتر نە پێویستم بەوەیە بت بم.. نە بتپەرست بم؟

چیتر ئەقڵی من.. دەروونی من.. بوونی من.. ئازادی من.. مافی من، جێی حەوانەوە نییە بۆ تەوتەمە خۆماڵی و بێگانەکان! لەسەر خاسیەتی مرۆڤبوونی خۆم چ بە شێوەی ئەقلانییانە و.. چ بە شێوەی ڕۆحییانە، لە خێزانەکاندا.. پەرستگاکاندا.. قوتابخانەکاندا.. دامەزراوەکاندا، بێدەنگ نابم و بە چاونەترسییەکەوە کە پشت ئەستوورە بە تەوژم گەلێکی فیکری و ڕۆشنبیری و کولتووریی، کە ڕۆڵێکی بنەڕەتی دەداتەوە بە- من- و کەسایەتییە ئینسانییەکەم و بوێرانە، لە نێو ئەو ئاژاوەگێڕییە سەرنگوومکەرانەی کە نەیانهێشتووە نەوەکانی ئێمە ڕوو لە خۆیان بکەن و بە هەموو بوونیانەوە قوربانی بوون و.. کەساسانەش ڕوویان لە قاپی و دەستی پڕ ڕەحمەتی ئایدۆلۆژیا و سیاسەت و ئاین کردووە و خۆیان بە پارێزەری ئەم پرەنسیپانە نەزانیوە کە لێیان داماڵراوە: (بوێری بیرکردنەوەت هەبێت.. بوێری بۆ خۆت بیت.. بوێری ئینسان بیت- کانت-) هەتا لەوێوە ڕێنموویی و کۆشش بۆ قەرەبۆی ڕۆحی گونجان و تەبایی بکات. ئەگەر نەوەی نوێ بە مەزنییەکەی لە دەستی بێت، ئەو مەزنییەی (کە بڕیار بدات خۆی بێت- کانت-) پوخت.. بە سێگۆشەیەکی دەچوێنم، لووتکەی ئێستا و.. دوو گۆشەکەی بنکەکەیشی ڕابردوو و.. داهاتوو بێت.

بتوانێ هارمۆنیکییەتێکی پڕ لە ڕیتم لە نێوان وێنە جیاوازەکانی ئەو سێ پنتە و نێوانەکانیاندا بخوڵقێنێ و بسازێنێ، ئەوجا بە لێپرسراوەیەتی لە ئاست خۆی و



ئەوی تردا، بە دەروون ڕوونییەوە و لێوردبوونەوەیەکی قووڵی ئێتیکییانە، نەک بەرژەوەندی خوازانە.. دەتوانێ حورمەتی زیندووەکان و قوربانییەکانیش بە بەهای خۆیانەوە بگرێت. بەبێ ئەوەی بانگەشەکەری مەرجەکانی ئیرۆسیەتێک یان تاناتۆسیەتێک بێت و ببێتە جەنگاوەریان، بەڵکو لە دەرەوەیاندا بەوە دەگات هەموو ئەوانە بە (شێوازێک لە شێوازەکانی بوون دەبینێت- ئۆیگین فینک-)

**- ئایا ئەدەبی کوردی بە تەعریفە جیاوازەکانی ئێوەوە بۆ ئەدەب چەند بەرپرسیارە لەبەردەم بیرنەکردنەوەدا لە ئەنفال؟**

- ئەنفال کارەساتێکە لە جێگەیەکدا.. لە زەمەنێکدا ڕووی داوە. کە- جێگیر و نەگۆڕ- ەکانی ئەو ڕووداوە بە هەموو نهێنییەکانەوە دەخوازێ زانیاریمان لە بارەیەوە هەبێت و بە دۆکۆمێنت بکرێت. هەتا بە بەڵگەوە بچێتە خانەی مێژوویی خۆی و لە پاڵ تراژیدیا تاقانەکانی تری وەکو هۆلۆکۆست لە لایەن ئایدۆلۆژییەتی نازیستی ئەڵمانییەکانەوە و.. ئەرمەنییەکان لە لایەن ئایدۆلۆژییەتی مەزهەبییانەی بارگاویکراو بە نەژادی تورکەوە و.. بۆسنە و ئەلبانییەکان لە لایەن ئایدۆلۆژییەتی تۆتالیتاری سربیاوە و.. ئەنفال لە لایەن ئایدۆلۆژیای شۆڤێنی عەرەبی زاخاودراو بە چاکترین نەتەوەوە! دەچنە خانەی فینۆمینەوە.. کە جیهانی دیاردەکانە. کە لەسەر (دەرکەوتن و ئاشکرابوون) وەستاوە. واتە ئەو جیهانەی لە بەرچاوماندایە و بە هۆی هەستەکانمانەوە دەیناسین و ئەقڵیش دەتوانێت بیخاتە ژێر پرەنسیپەکانی خۆیەوە بەبەڵگەی ئەقلانی و مەیدانی و زمانی لۆژیکییانەی هزر بسەلمێنرێت.

کەچی ڕەوشی ئەدەب ناجێگیر و گۆڕدراوە- بە خوازە و ڕەمز و هێما و مانا و نیشانەکانیشیەوە، کە دەچێتە خانەی نۆمێنەوە- واتە- (جیهانی شتێک لە خودی خۆی) کە جیهانێکی ون و شاراوەیە. ئەم دوو چەمکەش لەلایەن ئیمانوێل کانتەوە هاتە نێو ڕێڕەوەکانی بیری نوێوە. داخوا ئەم دوو خەسڵەتە گۆڕدراو و نەگۆڕاوە چۆن بتوانین تێکەڵ بکەین و لە یەکدی نزیک بخەینەوە؟ لە کاتێکدا کە ئەنفال سەر بە زەمەنی فیزیکی و.. ئەدەب سەر بە زەمەنی بێ گەرد، یان ئەو دیو زەمەن بێت- برجسۆن.

بەو مانایەی ئاراستەیان.. زمانیان.. زەمەنیان.. کەرەستەکانیان.. میتۆدیان... تاد. دەتوانین بە دوو ئاراستەی جیاواز و پێچەوانەییدا گوزەرانیان ببینین؟ دەرهەق بەم دوو ئاراستەیە، نیچە دان بەوەدا دەنێت کە ئەو واقیعەی هۆکارەکانی- زانین- و - ناسینی مرۆڤ- هەستەکان- وێنەی دەکێشێت، جیاوازە لەو واقیعە ڕاستەقینەیەی کە هەیە. چونکە لای نیچە جیهانی دیاردەکان ئەو جیهانەیە کە ئەقڵ دەتوانێت بیخاتە ژێر پرەنسیپەکانی خۆیەوە. ئەو جیهانەیە کە بەهۆی هەستەکانەوە دەرکی پێ دەکەین. بەڵام (جیهانی ڕاستەقینە) لای نیچە ئەو جیهانەیە کە هەمیشە لە گۆڕان و وەرچەرخاندایە و (هۆکارەکانی زانینی مرۆڤ) ناتوانن بیناسن. لێرەوە ئەنفال بەو دیوەی کە ڕووداوە نیوەی سەر بە فینۆمینە و ئەمەش دەخوازێ کە لە ڕووی زانستە مرۆڤایەتییەکانەوە، بناسرێ و ناو لێ بنرێت و شی بکرێتەوە و بە دۆکۆمێنت بکرێت.

نیوەکەی دیشی کە گۆڕاو و ناجێگیرە (لە نێو خۆیدایە و شاراوەیە و ونە) کە بە ڕای نیچە ئەمە (جیهانە ڕاستەقینەکەیە) ئاشکراکردن و دۆزینەوە و دواندنی ئەو جیهانەش ئیستاتیکییانەیە و خەیاڵی داهێنەرانە لەوێدان و بەها ونبووەکانی مرۆڤبوون، کە مێژوو.. زانستەکان بەسەریدا تێپەڕیون و نەیانبینیوە. ئەم (ئیستاتیکا) دەیخاتەوە سەر ڕەوتە بەردەوامە- صیرورە- ناچۆڕاڵییەکەی خۆی.

ئێمە لە تانوپۆی هەردوو بوارەکەدا هەژارین و پەلەقاژێمانە. وەکو ئاماژەمان پێ کرد هەموو کایە مەعریفییەکانمان ڕەت کردۆتەوە و تەڵاق داوە یا ڕاستتر شاربەدەر کردووە و کورت کردۆتەوە بۆ کۆمەڵێ وەزیفەی ناوئاخن پووچ و ترسێنەری سیاسی و ئایدۆلۆژی و.. بەوەفا و گوێبیستی پەند و وەعزە سەرخۆشکەر و فەرمانە چۆکپێدادەر و پەیمانە دەستخەڕۆکەر و لە بیرکەرەکانی ئەوان بووین. ئەمەش ئەوە دەگەیێنێت ڕێگەکانی بوونمان ون کردووە و بەم کاڵفامییەمان نکوڵیمان لە بوونی ڕاستەقینەی خۆمان کردووە.

چونکە.. بە کایە مەعریفییەکانی تر خۆمان نەدۆزیوەتەوە و نە پشکنیوە و نهێنییەکانمان هەڵنەکۆڵیوە و ڕێگەی تازەمان کەشف نەکردووە و مانای سەردەمییانەمان دانەڕشتۆتەوە و برەو پێ نەداوە و لە جێی مانا سواوە مەزهەبی و



ئایدۆلۆژی و فەرهەنگی کۆلۆنیالیستانەی دەر و دراوسێکانماندا. دەربارەی نەخشە و پێگەی بوونی خۆمان لە نێو ڕووناکی و سێبەری کولتووره جیاوازەکانی مرۆڤایەتیدا سەرنگووم و گومناو و نەبینراو بووین. هەر ئەمەش بووەتە مایەی ئەوەی هەمیشە لاڵ و زارەترەک بین لە گێڕانەوەی تراژیدیا تاڵەکانی خۆمان و لە دەستمان نەهاتووە ڕەمز و هێما و ماناگەلێکی لێ هەڵبهێنجین کە لە فەرهەنگی نەوەکانی داهاتوو و جیهانیدا مانادار بن و ببنە ژێدەر و سەرچاوەگەلێک بۆ هەموو ئەو بوارانەی گەرەکیانە بە گوتراوەکانمان بماننناسن و ناوزەدمان بکەن و.. ئێمەش ڕازی بکات و بڵێین: بەڵێ ئەوە ئێمەی نرخێنراوین بەپێوادنگی خودێکی هوشیار و.. مرۆڤێکی ئازاد و.. کۆمەڵگەیەکی کراوە و.. مێژوویەک، کە ئاوسە بە (ئیرادەیەک.. کە بە وزە ڕۆحییەکەی هەمیشە پارێزگاری ژیان دەکات و ژیان بڵاو دەکاتەوە- شۆبنهاوەر-)

**- ئایا ئاستی ئەو ترسە شاراوەیەی لای ئینسانی کورد هەیە بەرامبەر کوردبوونی خۆی، ترسێکە خاوەنی هێزێکی ڕۆشنبیری وایە کە بتوانێت لە بری تۆڵە خۆبکات بە هێزێک کە هەڵگری لێبووردن بێت. ئایا ئەم هێزە چەند دەستەڵاتی کوردی لێی بەرپرسیارە و چەندیش کۆمەڵگەی کوردی و ڕۆشنبیرەکانی بەرپرسیارن لە پیشاندانی؟**

- دەتوانین هەر ئێستا لەو پرسیارانەی بەڕێزتان، کە ڕووبەڕووی کۆمەڵێ نووسەرتان کردۆتەوە بە جیاوازی دنیابینی و سروشت و میتۆدی کارکردنیانەوە و بە (پێنووسی جیددی) دەربارەی پرسی ئەنفال ناویان دەبەیت، بە دەروازەیەک لە نەریتی لێبووردەیی بە گەڕ بخەین و چاو لێ بکەین و تێبگەین و بڵێین: کۆڕامانێک بێ ئەوەی، هیچ ڕامان و لێکدانەوەیەک بە دوا ئەنجام و تەفسیر دابنێین. تەنها ئامانج لەو خوێندنەوە و هەڵسەنگاندنە جیاوازانە نیشاندانی هەمەڕەنگی ئەندێشە و لێکدانەوە جیاوازەکانە. بۆ نمایش و خستنەڕووی ڕەهەندگەلێک لە نێوان (پێنووسە حیزبییەکان) و (پێنووسە جیددییەکان) دەخرێتە بەرچاو. هەتا لەلایەن گرووپی سێیەمەوە تاووتوێ بکرێن و فۆرمێکی تازەی لێ هەڵبهێنجرێت. ئا لێرەدایە

بۆچوونەکەی جون سیتوارت میل دەمانگرێتەوە کە دەرهەق میکانیزمی لێبووردەیی ڕای وایە (دوو باوەڕی دژ بەیەک، هەریەکە و بە جیا بەشێک لە هەقیقەتی پێیە؛ لەم حاڵەتەدا- باوەڕی سێیەم- بێتە ئاراوە.. کە وێڕای جیاوازیشی لەتەک هەریەک لە باوەڕە دژ بە یەکەکاندا، لە هەقیقەتی هەردوولایان بەهرەمەند بێت و، کۆی ئەو هەقیقەتانەش لە- فۆرمی ئەندێشەیەکی تازەدا- لە خزمەت کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا دابنێت). چونکە گەوهەر و کرۆکی لێبووردن ئەگەر لەسەر هیچ هاوپەیمانییەتێکی ئەخلاقی.. فیکری.. ڕۆشنبیری و ئینسانیانەدا خۆی شێوەباز نەکردبێ، ئەوە لێبووردەیی نییە.. بەڵکو خۆ بەکەمزانینی دەروون گرگنی کۆیلەیەکە، یان خودمەزنی ستەمکارێکە کە بە نەیار و جەللادەکەی دەڵێت: بمفلیقێنەوە، خۆ منی ماسۆشیست لە دواجاردا لە تۆی سادیست دەبوورم.. یان بەپێچەوانەوە!! هەروەها میل لە سایەی ئەو لێبوردەییەدایە ڕووبەڕووی ئامانجێکمان دەکاتەوە کە ئەمەیە: (لە بەرامبەر باوەڕە نەیارەکاندا زەمینە بۆ خستنەڕووی باوەڕە جیاوازەکان خۆش دەبێ و، بەم جۆرە شێمانەی- گرێدانەوەی بەشەکانی هەقیقەت- کە لە نێوان ڕەقیبە فیکرییەکاندا دابەش بووە، دێتە ئاراوە). ئەمە ئەو هێزەیە کە ڕۆشنبیران کاری بۆ دەکەن و لە پاراستنی- پرەنسیپەکانی هاتنە کایەی ئەو هێزەدایە- بەشێوەیەک لە شێوەکان لێپرسراوەتییان دەکەوێتە ئەستۆ! لایەنی کەم بەشێوەیەکی پراکتیکی و بەرجەستە پیشانی خۆیشی دەداتەوە و دەسەلمێنێ: یەک هەقیقەت بوونی نییە و نابێ. ئەوەی هەڵگری سامانی هەقیقەتێکی جودا لە تۆ بوو نەیار نییە.. بەڵکو تەنها لە تۆ جیایە!

ئەم نەریتە بۆ ئەوەی دادپەروەرانە لە نێو هەموو بوار و ئاستە جیاوازەکانی کۆمەڵگەدا وەکو یەک خۆی نمایش بکات و بەڕێوە بچێت و هیچ گرووپێک هەست بە پێشێلکردنی مافی خۆی نەکات و بە بنەماکانی هەمان پێودانگیش بە دەسەڵاتەکانی تر بێژین: بەڕێزینە.. ئاینامە حیزبییەکەی ئێوەش گوزارشت لە دەنگ و ڕەنگ و بۆی گشت مەیلە جیاوازەکان ناکات و- ڕۆحی باڵای نەتەوە- بۆ ئەوەی لە نێو مەنگەنەکانی ئایدۆلۆژیا تۆتالیتاریەتەکەی ئێوەدا مەحف نەبێتەوە و پێبگات.. دەشێ بوار بۆ ڕادەربڕینی ڕا و بۆچوونە جیاوازەکانیشی نێو هەناوی کۆمەڵگە بهێڵێنەوە



و.. ئەوەی لە دەسەڵاتدا بۆ ئێوە ڕەوایە، دەشێ هەموو گرووپەکانی دەرەوەی تۆش هەمان ئامراز بۆیان ڕەوا و فەراهەم بێت. ڕوونتر پێیان بگوترێ، چیتر نابێت و ناشێت هەموو دەسەڵاتەکان لە لایەن کەسێکەوە یان گرووپێکەوە قۆرخ بکرێن بەڵکو دەبێت دەسەڵاتەکان دابەش بکرێن. هەتاوەکو (مافە سروشتییەکانی تاکە کەس و گرووپ- سەبارەت بە ژیان و ئازادی و موڵکدارێتی پێشێل نەکرێت- جۆن لۆک-)

بۆ ئەوەی ئەم بنچینەیەش سەقامگیر بێت و ساختە نەبێت وەکو دروشمە پووچکراو و بێ ناوەڕۆکەکانی ترتان دەبێ (هەرسێ دەسەڵاتەکە- جیبەجێکردن و دادوەری و یاسادانان- لە یەکتر جودا کرابێتنەوە و چاودێری یەکتر بکەن، ئەمەش دەبێتە مایەی بەهێزکردنی یەکتری و لەگەڵ دەسەڵاتەکانی تر هاوسەنگی دەکاتەوە- مۆنتسکیۆ-) ئەمەش ئەو ئەرکەیە کە دەکەوێتە سەر دەسەڵاتی کوردی.

بۆ ئەم ئەرکە ئینسانگەرایەش، دەبێ هەمیشە لە ڕووی فیکری و ئەخلاقییەوە، سروشتی ئەو ئاستەنگانە بناسین و تێبگەین.. کە دەبنە هۆی سنووردارکردن و ئیفلیجکردنی بەرهەمهێنانی پرسی لێبووردەیی.

بە دیوێکی تریشدا نەبووە و ناکرێ پاسەوان و پارێزگاری ئارامی و ئاسایشی ناو کۆمەڵگەکەی خۆت نەبیت، لەگەڵ دەرەوەی خۆتدا بێ گرفت و ئارام بچیتە پێشەوە. ئەوەی ئارام نەبێت لەگەڵ خۆیدا.. چۆن دەتوانێ ئارامی ببەخشێت بە دەرەوەی خۆی؟

دەشێ ڕۆشنبیران لەو دۆخ و ڕەوشانەدا، نادیدە نەبن و لەسەر پێ و دەستپێشخەر بن بۆ ڕەخنە و لێتوێژینەوە و بە توانستەکانیان.. خەڵکی و دەسەڵات و دامودەزگاکانیان هۆشیار بکاتەوە لەو مەترسیانەی سەری خۆیان و ئەزموونەکەشمان دەخوات!

# دیاردەی لەشفرۆشی

سازدانی: غەفوور هیرانی

**– لە ئێستادا کوردستان بەناو هەلومەرجێکی ئاڵۆزی سیاسیدا تێدەپەڕێ، لە پاڵ ئەمەشدا گرفتی کۆمەڵایەتی ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادبووندان، شانبەشانی ئەمەش دیاردەیەکی کە لە جاران زیاتر دێتە بەرچاو ئەویش (لەشفرۆشییە) ئەمە جگە لەوەی بە هۆی کەبتی سێکسییەوە گەنجانێکی زۆر مشتەری بەردەوامیانن، بەڵام لەگەڵ خۆیدا دنیایەک گرفتی کۆمەڵایەتی و کێشەی تەندروستی دێنێتە ئاراوە، پێت وایە لە ئێستادا حکوومەت چی بکات باشە.**

– زۆر سادە.. هەر ئێستا و بە بەردەوامیش بۆ ئایندە، فەرمانی حکوومەت بۆ دەستەبەرکردنی بیناکردنەوە کۆمەڵایەتییەکان ئەوەیە و دەبێت بە بەرپرسیارییەتە کۆمەڵایەتییەکان هەستێت لە کۆمەڵگەدا. لە ڕێی برەودان و کاراکردنی بەهرەکان لە بوار و کایەکانی دەروونناسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و پەروەردەیی و یاسایی و زانستیدا، هەتا ئەو توانایی و متمانەیە لە خۆیدا پەیدا بکات، لە زیان و مەترسی دومەڵە بە تیراوێ بووەکانی سەر جەستە و دەروونیی بفکرێت و.. ڕەگ و ڕیشەی ئەو نیشانانە لە شوێنە ئەسڵییەکانی خۆیاندا ببینێ و.. تێبگات و هەست بە دارمانەکان و کرۆشتنی ئەو ئازار و سوێیە دوو سەرەی دەروون و جەستەی کۆمەڵانی خەڵکی بکات، کە ملکەچبوونی داخوازی و پێداویستی و سکاڵا و نارەزاییەکانیان لە نێو پشت تێکردنی نارێکی و پێکی ئیداری و ڕۆتین و گەندەڵکارییەکدا فەرامۆش و پێشێل دەکرێ و لە دواجاریشدا، هەر ئەمەش فاکتەر و هۆیەکی ترە بۆ پەرەگرتن و بووژاندنەوەی هەڵچوون و یاخیبوونەکان و.. بزواندنی زەمینە و لەوەڕاندنەوەی وەهمی پڕ گرفتی (وردە کولتوورە لادەرەکان و دژە کولتوورەکان) یشە. کە پێ دەچێ حەز و ئارەزوو و چێژی ڕەها بەوە بپێون و هەڵگرتبێتنەوە کە (چەند موڵکم هەیە و



چەندیش بەکار دێنم، بوونیشم هەر ئەوەندەیە! چارم نییە دەبێ ئێرەیی بەوانە بەرم کە لە خۆم زیاتریان هەیە و لەوانەش بترسم لە من کەمتریان هەیە!! –فرۆم–) ئەم فەزا پڕ فەوزایە دەمانخاتەوە بەردەمی ئەم پرسیارەش (ئایا چاوچنۆکی و سووکنایی بە یەکەوە هەڵدەکەن؟ –فرۆم–)

هیچ نەبێت، حکوومەت دەبێ بە ئەزموونەکانی پێش خۆی و دەوروبەرەکەی تێبگات هیچ دەست و تەوقێکی ئاسنین نییە) ئەم نالەباری و بەڵای پەتایانەی لە کۆڵ بکاتەوە، دەستی بەڕێوەبردنێکی هۆشمەندانەی شارستانییانە نەبێت. دەستی عەقڵییەتی ئیداری.. نەک ئەقڵییەتی حیزبی و گەلەکۆمەکی گرووپ گرووپێنە! دەستی خۆ سکۆلارکردن لە نێو ڕەحمی کۆمەڵێکی مەدەنی.. نەک پاشەکشە بۆ نێو دیوەخانی خێڵایەتییەکان! دەستی یاساگەلێک بەڵێننامەی هاوولاتیبوونی هەموو گرووپ و پێکهاتە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵگە لیبراڵانە دەستەبەر بکات و لە بەردەم ئەو یاسایەدا هیچ یەکێک لەو گرووپە جیاوازانە چاوی لە سڕینەوە و گوێی لە قرچە و هەڵوەرینی وجودی مرۆڤانەی خۆی نەبێت.

لێرەوە دەتوانین بڵێین، لەشفرۆش و.. لادەری سێکسی کەسانێکن هەست دەکەن نابینرێن وەک ئەوەی خۆیان وێنا و تەمەننای دەکەن، بۆیە ناهۆشیارانەش بێت.. هەموو ئەو ڕێگرییانە تێکوپێک دەشکێنن کە دەبنە مایەی ئەو نەبینینەیان. بگرە دەست بۆ ئەو بەکاربردنانەش دەبەن کە لە دواجاردا بە وردوخاشکردنی گەوهەری ئینسانی و ونبوونی کەسێتی خۆیان تەواو دەبێت. لەگەڵ حەرامکراوەکانی دابونەریتەکاندا پێک نایەن و نەخۆشی لە ژینگەکانی یەکتردا دەزێن و دەژێننەوە و دەتەقێن. بەڵێ کارەساتەکان پێمان دەڵێن: مرۆڤ هەر کە هەستی کرد بەپێی پێوەرە کۆمەڵایەتی و سیاسی و مۆراڵییەکان بە شایستەیی خۆی نابینرێ، بۆ بینینەوە و نیشاندانی خۆی دەست بۆ هەموو شتێک دەبات، هەر هیچی دەست نەکەوت.. ناچار بۆ دەستکەوتنی شوناسێک لە بوارێکی موڵکایەتیدا دەست بۆ شوناسی جەستەی خۆشی درێژ دەکات لە بواری بوونایەتیدا. ئیتر لەو تەنگژە و گرێژنە چوونە بە–مقایچە– بووەدا، گرنگ نییە ئەو بینینە چییە و لە چییەوە هاتووە و دێت، گرنگ ئەوەیە دەرکەوێت!

بە بڕوای من یەکێک لەو هۆیانەی لەشفرۆشتن و هەراجکردنی ماهیەتە ئینسانییەکەی دەکاتە ڕەفتاری گرووپێک و لێ دەگەڕێ ئەوی تر بیخاتە ڕستەکانی خۆیەوە، لەدەستدانی ئازادی و ئیختیارێکە کە ئەو کەسە قوربانییە پێی وایە چیدی ئەم پرسە، واتە ئازادی و ئیختیار پەیوەندی بەوەوە نییە و بگرە پێویستیشی پێی نەماوە. ئەو مرۆڤەی بەردەبێتەوە بۆ ناو ئەو فەزایەش، دەبێتە کەسێک کە ئیتر گوێکانی.. توانایی بیستنی ئاوازە نوێکانی جەستە و ڕۆحی خۆی نەماوە، چونکە تەپ و سڕ بوون. ئیتر ئا لەو کاتە ناکاتانەدایە کەسی لادەر، پەرۆشی لە پرسیارکردن لە چییەتییەک نابێت لە خۆیدا، نەک لەبەرئەوەی نایەوێ.. بەڵکو بەها و پرۆژەیەکی نامێنێ بۆ جەستە هەتا بیداتێ و ئاوێزانی ببێت. تەنها ئەوە نەبێت جەستە خوانێکە.. سینییەکە بۆ خستنە ڕووی میوەی لەزەت و تامی شەهوەت پێشکەش بە خواستی موشتەرییە برسییەکانی دەکات. ئیدی بۆ ئەوی لەشفرۆش جەستەی بە ئیرادەی خۆی دەرناکەوێ و ناجووڵێنێ و نمایش ناکات.. بەڵکو ئەو ڕوو ڕازاندنەوەیە لە خزمەت خڕکردنەوەی زۆرترین تەماشاچی و ئارەزووەکانی ئەوانی تردایە، بە خاتری پاراستنی مانەوەی ئەو جەستەیە لە نێو خاوەندارێتی و ئیغرائاتی دەستکەوتگەلێک کە کەسی لادەری سێکسی پێی وایە بۆ ژیانەکەی پێویستە . هەر بۆیە گەر کەمێک وردببینەوە لە پانۆراما و بیۆگرافیای کەسی لادەر، دەتوانرێت گشت شکستەکانی کۆمەڵ کە لە جەستە سڕاوەکەیدا دەجمێن.. ببینینەوە. ئیتر لە کۆمەڵێکی ئیرادە ئیفلیج بوو و سەقەتی وەک ئێمەدا، لە حوکمڕانییەکی شەق و شڕ و دەغەزاربوو بە ژاوەژاوەکانی ئایدۆلۆژیا، دەکرێ چاوەڕوانی ئەوە بین، لەشفرۆشێک.. بۆ سەرمایە ڕۆحییەکەی فریای ئەوە بکەوێت و قەلەقی ئەوەی هەبێت و لە خەمی ئەوەدا بێت من بوونم بە ماهیەتەکانمەوەیە؟ یان گەوهەرم بوونمە، یان بوونم گەوهەرەکەمە؟

بۆ جێکردنەوە و ئاراستەکردنی پرسیارگەلێکی ئاوها کە قابیلی کردنن و دەبێ بکرێن، بە لایەنی کەم و بۆ هەنگاو هەڵگرتن بەرەو ئەو نەخۆشی و لادانانە دەشێ حکوومەت بە گفتوگۆ لەگەڵ گرووپەکان و.. ڕاوێژ بە بیرکەرەوەکان و.. پرسیار بە پزیشکە کولتووری و یاسایی و زانستە کۆمەڵایەتییەکان بکات، هەتا لە ناو دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکاندا ناو لە هەموو شتانە بنێنەوە کە کرمەڕێزبوون یان



هەڕەمەکییانە ڕێیان کردووە و ڕێدەکەن و.. بەشێوەیەکی زانستانە و ئەکادیمییانە مانا و بەهای پرۆسە و خەسڵەتی خۆیان پێ ببەخشنەوە، کە لەگەڵ پێگە و هەڕەتبوونی ئازادییەکانی خۆیاندا ڕێ بکەن و هاوتا بێنەوە.

ئەم پرۆسەیەش لە ناو ئەکتیڤبوونی ڕەفتارە دامەزراوەییەکان کە پراکتیزەکردنی فۆرم و بەهاکانە لە ئاستێکی تردا داوامان لێ دەکات و دەمانگەیەنێتەوە بەوەی، لە ڕێگەی ئەقڵی کراوەی خەڵکانی ئیرادەخوازەوە جارێکی تر دەستکاری ماهیەتی حکوومەتیش بکەینەوە. بە داخەوە حکوومەتێکیش خۆی حیزبسالار و دەسەڵاتسالار و خۆسالار بێت بەسەر ئیرادەی کوێرکراوی خەڵکییەوە، ناتوانێ بە دۆعای ئاوها بڵێت ئامین! من لێپرسراو دەناسم بۆی گێڕاومەتەوە کە بە هەرزەکاری لەتاو شەهوەتی سێکس لەگەڵ دوو برادەریدا چوون سیپەلکی حەیوانیان هێناوە فوویان تێ کردووە و دەمەکەیان بەستووە هەتا دەرپەڕیوە بە خەیاڵی سمت و قنگی ئافرەت عەورەتیان پیا هێناوە تا ڕەحەتبوون. تۆ بیر لەو تراژیدیا/ کۆمیدیایە بکەرەوە و ورد بەرەوە گەر ئەو کەسە دەسەڵاتی سیاسی، ئابووری هەبێت چی دەکات و بەو هەموو چەپاندنانەوە مێینە چۆن و بە چی دەبینێ؟

هاوڕێی ئازیز.. تۆ سەرنجی ئەو دیمەنە مێگەلییەی دوعات داوە کە چۆن ئازادیی و ئیختیاری کیژۆڵەیەک سەنگەسار دەکرێت؟ کەچی دیمەنێکی مێگەلییانەی تر هەروەکو ئەو بە دیوەکەی تریدا دەبینین کە چۆن گەنجە خوێن قوڵپدەرەکانمان، پلان دادەنێن و بە لێشاو دەچن بۆ هەڵمەت و چالاکی سێکسی لە سووریا و وڵاتانی دەورویەر و لە ناوخۆی وڵاتدا؟ سەرنجێکی کەناڵەکانی تەلەفزیۆن بدە.. کوڕوکاڵان چۆن مەسیج دەگۆڕنەوە و چی لە دڵ و دەروونیاندا دەجۆشێ لە بەرامبەر یەکتریدا کە بێ ئەوەی یەکترییان دیبێ.. یان فرسەتی یەکتر بینینیان بۆ بڕەخسێ!؟

ئاخۆ ئەم درامایانە نیشانەگەلێک نین کە ئینسانی ئێمە بە دەست چەپاندنەکانیانەوە لە ناوەوە چەند هەلاهەلا و وێرانن. ئایا ئەقڵێکی وێران.. دەروونێکی وێران.. کەسێتییەکی وێران.. خودێکی وێران، دەوێرێ و بە ئیرادەیەکی زیندوو، دەکارێ و دەتوانێ کۆمەڵێکی لە خۆی تەندروستتر ئافەریدە بکات و بپارێزێت؟

**– هەن دەڵێن چارەسەری ئەمە تەنها بەندە بە پرۆژەی حکوومەت لە ئاستێکی فراواندا بەم شێوازەی لە ئەورووپادا هەیە، یاخود ئەو شێوازەی کە زۆر لە وڵاتی عەرەبی گرتوویەتە بەر بۆ کۆکردنەوەیان و چاودێریکردنێکی وردی تەندروستی، دەنا چارەسەری مەحاڵە.**

– ئایا بە ڕەنگکردنی ئینسانەکان، بۆ خاتری ئەوەی کەسانی سەر بە کاری ناشەرعی و بێ ڕەوشتی لە یەکتر جودا بکرێنەوە؟ ئایا ئەو کەسانە بەشێک نین لە تێکشکانەکانی ناو کولتووری ئێمە و دەبێ فرێ بدرێنە زبڵدانەوە؟

ئایا چ پەیوەندییەکی ئازادانەی نێوان نێر و مێی ئێمە ڕێگە پێ دراوە و شەرعیەتی هەیە، هەتا لەشفرۆشی بە تاقانەیی بمێنێتەوە و تەنها ناشەرعیەتێک بێت لە ناوماندا! لەشفرۆشەکان ئەو کەسایەتییە فریودراوانەن، کە بە ناچار موشتەرییەکانیان فریو دەدەنەوە. ئەوان بەجێماوەکانی ناو مەملەکەتی ئازادی نین.. بەڵکو قوربانییەکانی کۆیلەیەتییەکن کە هەر دابونەریتەکانی خۆمان دەستی هەیە لە شکستەکانی ئەواندا! دەستبردن بۆ ئەو کێشەیە، بە بێ ئاوڕدانەوە لە ماف و ئازادییەکانی تاک و تێگەیشتنیان و فەراهەمکردنی میکانیزمەکانی.. خۆ دزینەوەیە لە ئەرکێک کە دەکەوێتە سەر دامودەزگاکانی حکوومەت و کۆمەڵی مەدەنی.

**– بەو پێیەی خۆت لە ئەورووپا دەژیت، بە تەجروبەی ژیانکردنی خۆت لەوێ دەکرێ چی بکرێت لە ئێستادا بەرامبەر ئەم دیاردەیە، بە تایبەت میکانیزمی غەربی لە ئێستادا لە لایەن خەڵکەوە مەقبول نابیندرێت، بە حوکمی ئەو بارودۆخە کولتوورییەی کە لە کوردستاندا زاڵە.**

– یەکێک لە ڕێگرییانەی ئەو دیاردەیە بەرهەم دەهێنێتەوە و ڕێگە نادات بیر لە ڕێگەچارەیەکی تر بکرێتەوە، ئەو تابۆیانەیە کە بە ناوی کولتوورەوە ساغ دەکرێنەوە، بۆ نموونە چاودێریکردنێکی دینییانە و ئەخلاقییانە و کۆمەڵایەتییانەی ئافرەت بۆ ئەوەی باش بێت. ژنی باشیش ئەوەیە (کە پێداویستییەکانی هەمووان، بێجگە لە پێداویستییەکانی خۆی دابین دەکات- کریستیان نۆرترۆپ-) ئەم هێڵە سوورانەش لە



ڕاستیدا لە قەید و بەند زیاتر نین، هەر ئەوەشە نووچی پێداداوین و پا شکستی کردووین و برستی چوونە پێشی تواناکانی لێ بریوین. هەر کریستیانی پزیشکی ژنان پێی وایە:

(ئەو کولتوورەی کە پشتگیری لە ژنان ناکات، هەر لە سەرەتاوە زەمینە بۆ دووچاربوونی ژنان بە نەخۆشی ئامادە دەکات، لەبەرئەوەی ناوەڕۆکی ژیانی هەموو ژنێک بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر کاردەکاتە سەر تەندروستی ملیۆنەها ژن)

لە وڵاتە ئەسکەندەنافییەکاندا بە گشتی و بە تایبەت وڵاتی فینلاند لایەنی زۆری حورمەتی ئینسان گێڕاوەتەوە بۆ خۆی و.. هەموو کەس بەپێی یاسا مافی پارێزراوە. تەنانەت لەشفرۆشەکانیش لەو مافانە بێبەری نین و ە پێی قانوونی سزادان لەشفرۆشی تاوان نییە، ئەگەر هاتوو کەسی لەشفرۆش بە خواستی خۆی و لە ژێر هیچ فشارێکدا نەبێت لە دەرەوەی خۆیدا ئەوا ڕێگەی لێ ناگیرێت. بەڵام نابێت دوو لەشفرۆش بەیەکەوە بەم کارە هەستن لە جێگەیەکدا. هەتا بەرەو ئۆرگانیزە چوون نەچێت، هەر لەو سۆنگەیەوە کارخانە و کارخانەچێتی بەپێی یاسا ڕێگە نادرێت. چونکە بەکارهێنانی کەسێکە لە لایەن کەسێکی ترەوە، بەڵکە لەشفرۆشی تەواو بە کارێکی شەخسی دەدرێتە قەڵەم.

جگە لەوەش عیشق ئازادە، تەنها و تەنها هەموو مەرجەکان بەپێی ڕەزامەندی و ئیختیاری دوو کەسەکەیە و بەس، ئیتر هەرکەس دەخالەت لە ژیانیاندا بکات سزا دەدرێت. بەڵێ ئافرەتان بێ ئەوەی شووبکەن.. دەتوانن منداڵیان هەبێت و بە زۆڵیش ناوزەد نەکرێن و هەموو مافێکی خێزانیشیان پارێزراو بێت. ئەمە جگە لەوەی زۆربەی دامودەزگا کارگێڕی و فێرکاری و بەڕێوەبەرایەتی و سیاسی و سەربازی و بەرهەمهێنەرەکان ژنان ڕۆڵی دیاریان هەیە. لەگەڵ ئەمانەشدا ژنان تێدەکۆشن بۆ بە دەستهێنانی دەستکەوتی مادیی و مەعنەوی زیاتر.

**– ئایا ئەم هەنگاوانەی کە ئێستا لە کوردستان دەگیرێنەبەر، وەکو گرتن و کوشتن و کە هەر ڕۆژە لە ڕۆژنامەکان دەبیستین کە چەندین باند دەستگیر کراون، دەتوانێ چارەسەری ئەم وەزعە بکات.**

– کێشەیەک هەیە، کە پەیوەندی بە مرۆڤ و ژیان و ماف و ئازادییەکانییەوە هەیە، دەشێ هەر لەو سۆنگەیەوە لێی بڕوانین و لێکدانەوەی لە بارەیەوە بکرێت. نەک ئەوەی ئەم دیاردەیە چەندێک ئابڕووبەرانە و ئابڕوومەندانەیە. چونکە لە هیچ کۆمەڵگەیەکدا کولتووری بەرکەماڵ و بێ گوناه و پاکیزە نەبووە و نییە، ئەگەر لە دەرەوەی ئەم ڕاستییە، دەست بدەینە هەر کێشەیەک، ئەوا ئێمە بیر لە مرۆڤ ناکەینەوە.. بەڵکو زیاتر بە دوای سزادان و نەفرەتلێکردنەکانیدا دەگەڕێین (تاوان و لادان، جگە لەوەی هەردووکیان ناوێکی ترن بۆ ناکامڵبوون و پێنەگەیشتن.. هیچی تر نین –کۆڵن وڵسن–) بۆیە بەر لە هەر تەمبێکردنێک دەبێ لە زمانی ئەی. ئێم. ماسلۆوە دەرهەق بەپێداویستییە مرۆییەکانی کۆمەڵگە، لە پێداویستییە فیزۆلۆژییەکان (خواردن و خواردنەوە و نووستن.. تاد. پێداویستی ئاسایش.. پێداویستی ئینتیما بۆ گرووپ.. پێداویستی ڕێزگرتن و بایەخدان بە تاک و گرووپەکان. پێداویستی پەروەردەکردنی تاکەکەسی لە ڕێی وەرزش، هونەرەکان... تاد) بپرسین، بزانین دابین کراوە. ئەگەر نا.. ئەم گرتن و کوشتن و ئەزیەتدانە نیشانەی نەخۆشیگەلێکن کە حکوومەتی ئێمە بە دەستییەوە دەناڵێنێ و نەتوانینی بیرکردنەوەیە لە بەڵایەک کە خۆمان دەستمان لە سەرهەڵدانەوەیدا بەم شێوەیەی ئێستای هەیە. کوان ئەو پڕۆژانەی گەنجی ئێمە خۆی هەڵیبژاردبێت کە تەمەنەکەی لەم کات و ساتەدا پێویستیان پێیەتی خرابێتە ئیختیاریانەوە، هەتا هەست بە لێپرسینەوە بکەن لە بەرامبەر ئەو شتەی بە کردەوە پێی هەڵدەستن و لەوێوە ئامادەی هەموو کۆششێک بن بۆ بەرگری لێکردنی و بەرەو پێشبردنی و بووژاندنەوەی ئەو شوناسانەی گوزارشتێک دەبێت لە مەیل و ئارەزووی گەنجانەی ئەوان؟

**– ئێستا زۆر قسە لەوە دەکرێت کە میکانیزمی دینی لە بابەت هاوسەرێتی (میسیار) کە بڕیارە وەکو پڕۆژەیەک بدرێتە پەرلەمان ئایا دەتوانێ کۆتایی بەم شتە بهێنێ.**

– میسیار بیرکردنەوە و پڕۆژەیەک نییە بۆ بەرگریکردن لە پێداویستییەکانی مرۆڤێک کە بڕیارە بە ئازادییەکانی خۆی بخەملێت. چونکە کێشەکە لەوەدایە ئێمە بەر لەوەی



مرۆڤ ببینین و بناسینەوە بە بەها گەردوونییەکانییەوە، گوێڕایەڵی هێڵە سوورەکانی ئاین و سیاسەتین بە وەعز و جەبرەکانیانەوە. بەو پێودانگە ئاینی و ئایدۆلۆژییانە دەپێوین کە خۆیان هۆکارێکی ئەسڵی بوون لە چەپاندن و کۆنترۆڵکردن و وردکردنی زیاتری مرۆڤی ئێمەدا. بە ئاراستەیەکدا بردوویانە.. کە لە ڕێگەی بازاڕەکانی ئەوانەوە لە بەهاکانی خۆی بڕوانێ و.. خۆی ئارایشت بکاتەوە بەو شێوەیەی ئەو دەسەڵاتانە دەیخوازن. ئەوەی لەو نێوەشدا بە ئاشکرا غائیبە و فەرامۆش کراوە زمانی ڕاستەقینەی مرۆڤەکە خۆیەتی کە ژنانن. دەبێ پێش هەر شتێک ئەو زمانەی لە مرۆڤەکە سەندراوەتەوە و داگیر کراوە بۆی بگێڕدرێتەوە.

هەتا لەڕێگەی زمان پژانەکانییەوە، گوێبیستی ئەوە ببین (کەسێک دەئاخڤێ.. چ گرنگە ئەو کەسە کێیە– بارت–) بزانین چۆن لە هەست و نەستی خۆی دەدوێت و، گەرەکێتی چۆن چۆنی و لە کوێدا خۆی هەڵبگرێتەوە و.. لە چ خەون و خولیایەک بەجێ ماوە و چۆن ئاشنا دەبێتەوە بە خودە لە دەستچوو و بەیەکاچووەکانی ناوخۆی، لەگەڵ کۆمەڵەکەیدا ئاشت دەبێتەوە.

**– هەندێک کەس هەن جگە لە پاڵنەری ئابووری، وەکو حەزێکی تایبەتی مومارەسەی دەکەن، لەو حاڵەتانەدا کە بە ئیختیاری خۆی کەسێک ئەم شێوازە ژیانە هەڵدەبژێرێ چی بکرێت باشە.**

– من بڕوام نییە لە کۆمەڵگەیەکدا پرسی ئازادی، بە هەموو ڕەهەندە سەنگینەکانییەوە هەموو جومگەکانی نەتەنیبێتەوە، باس لە ئیختیار بکرێت.

زۆر سادە.. ئیختیار ئافەریدەکەری بنیاتی خۆیی و بەهاکانێتی و هەر بەو ڕەگەزانەش گەوهەرەکەی دەناسرێتەوە. ئەو کاتەی ئیختیاری خۆم دەکەم کەواتە ئەوە ئیختیاری منە بۆ ئینسانیبوونی خۆم.

ئاخۆ هیچ مرۆڤێک هەیە خاڵی لە کەئابە.. خاڵی لە لێپرسراویەتی.. خاڵی لە دەوروبەر.. خاڵی لە دڵەڕاوکێ؟ ئەگەر وایە لایەنی کەم، هیچ مرۆڤێک نییە.. نەختینەیەکیش بێت بیر لە خۆی و ئەوی تر نەکاتەوە. ئەمەش پێمان دەڵێت: (ناکرێ لەگەڵ ئەویتردا وەها ڕەفتار بکرێت کە وەسیلەیەکە، بەڵکو دەبێ وەکو غایەتێک لە

خۆیاندا بیانبینین- کانت-) کەوابێ ئەو هەڵوێستە فیکری و عاتیفی و ئەخلاقییەی بەرامبەر خۆمان یان خەڵکانی دەوروبەرەکەمان هەمانە، بەشێوەیەک لە شێوەکان نیشاندەرەوەی ئازادییەکە کە خودی خۆمان ئیختیارمان کردووە و خۆشمان لێپرسراوین لە بەرامبەر ئەو هەڵبژارنەدا. لەبەرئەوەی (هەر مرۆڤ پاشەڕۆژی مرۆڤە- پۆنج-) ئەمەش وریامان دەکاتەوە و ئەوجا داوامان لێ دەکات شکستە باڵ و شکستە ڕەوشتییەکان لە نیشتمان جیا نەکرێتەوە و.. وێرانتر نەکرێن لەوەی کە هەن، بەڵکو هاوڕێیانە دەبێ لەو کارکردانە بکۆڵرێتەوە کە گەیاندوونییەتی بەوەی بەهاکانی جەستەی خۆی ئیهمال بکات و وەکو وەسیلەیەک بیخاتە بەردەستی هەموو ناکەسێک. ئایا ئیهمالکرنی خود و بە وەسیلەکردنی جەستە، مومارەسەکردنی ئیختیار ئەگەیێنێت.. یاخود ونکردنی گەوهەری ئیختیار و غایەتەکانی دەگەیێنێت؟!

لە فیلمێکی دۆکۆمێنتاریدا بینیم ئافرەتێکی چینی (بە ئیختیاری خۆی!!) لە چەندین پێشبڕکێی سێکسیدا بەشداری کردبوو، بۆ خاتری ئەوەی ڕیکۆردێک بشکێنێ، هەتا گەیشتە ئەوەی سێ سەد و پەنجا پیاو بە دوای یەکدا لاقەیان دەکرد. ئەوەبوو ڕیکۆردی ئافرەتێکی ئەمەریکی شکاند. دواتر کە لە ژیانی وردبوونەوە ئەو ئافرەتە بە داو و دەرمانی بێهۆشکەر دەرۆیشت بەڕێوە، هەمیشە دەگریا و لە کەئابەیەکی کوشندەی کرۆنیکدا (مزمن) بوو. بە گوێزان و چەقۆ مەچەک و زۆر شوێنی خۆی بریبوو.. قێزی لە خۆی دەهاتەوە، بەڵام دەیگوت: کە زۆر خەڵک لە ڕوو دەمبینن، وا دەزانن من زۆر ئاسوودەم و گوێ بە هیچ شتێک نادەم. لە ڕاستیدا وا نییە. لە منالییەوە دایک و باوکی لە یەکتر جودا ببوونەوە و لە ڕێنمایی مەحەبەتێک کە ئینسان پێویستییەتی مەحرووم بوو. دواتریش بۆ بەڕێکردنی بژێوی ژیان ناچار بووە لەشفرۆشی بکات، دوای ئەوەی گوزەرانیان.. باشتر بووە، ئینجا ئەو گرێیەی تیا ماوەتەوە کە لە قوتابخانە و گەڕەک پێیان وتووە تۆ ناشرینی و کەس پێت ڕازی نابێت. بۆ وەلامدانەوە بەو گرێیە کەوتۆتە خۆ هەڕاجکردن و زۆرجاریش بۆ تەئکید و هاوسەنگکردنەوەی خۆی، قاچی دەخستە سەر سەری مشتەرییەکانی و گاڵتەی پێ دەکردن و دەیگوت: پێم بڵێ.. من ناشرینم، ئەگینا ناهێڵم دەست لە دەستم بدەیت؟

ئایا ئەو قوربانییەی کۆیلەتی خۆی دەڕازێنێتەوە.. خاوەنی ئیختیارە؟ لە کاتێکدا



کیرککارد گوتەنی (ئیختیار بۆ ئەوەی ببێ، پشت بە ڕیسک دەبەستێ لە نێوان هەموو ئەو ئەگەر و ڕووانەی کە مومکینە ببن. ئەو ڕیسکەش لە یەئسێکەوەیە سەرچاوە دەگرێت، کە سەرچاوەیە بۆ هەستکردن و بیرکردنەوە بەرەو هەڵکشان و بڵند بوونەوە و تێپەڕاندنی ئەو حاڵەتەی کە تیایەتی) نەک خۆی لەو حاڵەتەدا بهێڵێتەوە کە بە سووکایەتی جەستەی دەست پێ دەکات و بە نابووتکردنی کۆتایی دێ. ئەو جەستەیەی سارتەر لە- عەدەم و وجود-دا دەڵێت (من جەستەم، ئەوەشی دەمێنێتەوە عەدەم و بێدەنگییەکە لە ژێر زەمیندا) لەو پێودانگانەوەیە هەموو بەرپرسیارین لە بەرامبەر ئازادییەک کە جەستەکانی یەکتر پێویستیان پێیەتی. دەبێ مەرزی ئەو هەلومەرج و هۆیانە بزانرێ و بناسرێن کە بوونی ئینسانییانەی خۆمان لە بەرچاو دەخەن و بیر لەو ڕێگەچارانە بکرێتەوە، کە کەرامەت و حورمەتی ئینسانییانەمان بۆ دەگێڕێتەوە و زامن دەکەن. ئەوەی کە قسەکەری ئەسڵیشە دەبێ قوربانییەکان خۆیان بن نەک ئەو جەللادانەی وانە و فەرمایشتەکانی ڕەوشت بەرزیمان پێ دەفرۆشن و دەڵێنەوە.

**- تا چەند چارەسەری لە چەشنی ئەوروپا لە کوردستان بەپێویست دەزانن، لە بەرامبەر ئەم دیاردەیە.**

- ئەوروپاش گرفتی جیددی خۆی هەیە لەگەڵ ئەم دیاردانەدا کە کۆمپانیا سەرمایەدارییەکان هەموو شتێکیان سێکساندووە و هەموو شتێک بە کاڵاکراوە و دەستاودەستی پێ دەکرێت لە بازاڕەکانی قازانجدا. بەڵام ئەوە هەیە لە کۆمەڵێک جێ و ڕێی یاسایی و ئینسانی بەهرەمەندن، کە هیچ نەبێت ئاسایشی ژیانی ئینسانەکان بەرقەرارە و لە ڕووی تەندروستییەوە ڕێنماییان دەکەن، لە ڕێگەی وانەکانی قوتابخانەوە و کۆمەڵێ بنکەی هۆشیارکردنەوە و کەناڵەکانی میدیا و بەرنامەگەلێکی ڕۆشنبیریی و زانستییەوە هەمیشە سەروکاریان لەگەڵ ئەم دیاردانەدا هەیە. لەبەرئەوەی پێیان وایە (مرۆڤی شەڕەنگیز و ناشەرعی و خراپ، یان بە میراتی بۆی ماوەتەوە، وە یان کاریگەری کۆمەڵگەیە لەسەر باری دەروونی و جەستەییەکەی -ئەمیل زۆلا-)

کوردستان ڕاپۆرت

## کاریکاتۆری

## (دیمۆ+کراسی) و (مەلا+کراسی)

ئاخۆ هونەر.. بۆ ئاسایش و بالآبوونی ڕێسا ئیستاتیکییەکانی خۆی، دەبێ ئومێدی بەپێـرەوکـردن لە پرەنسـیپ و دابونەریتی هونەرییـانـەی خـۆی هەبێت، یـان گـوێ لە مستی مەرجگەلێک بێت کە لـە دەرەوەی بنیاتی گوفتار و کرداری هونەرییـەکەیدایە و پێش مەرجە ئاینی و سیاسییەکان بە تۆپزی فتواکانیان بەسەریدا فەرز دەکەن؟

ئاخۆ سامان و بەهای هونەر، قەدر و مـاناکانی.. زیاتر لە لای ئەهلی جوانی و بە تایبەت هونەرمـەندانە، یان لای گرووپێکی تر کـە سـەری ئەقڵ و دڵی لە ئیلاهییـاتدا نقوم کردووە؟

ئاخۆ ئیمـانداران و لە ناویاندا مـەلا بەڕێزەکان، بۆ نموونە لە شـەریعـەتدا لە ڕادەو ئاسـتـی مـەقـامـەکـانـدا: تەوبە، ئینابە، زوهد، قـەنـاعـەت، وەرع، صـەبر، شـوکـور، تەوەککول، تەسلیم، فـەنا، بەقـا، تـەوحـیـد، تـەجـرید، تەفـرید، عـوبودییـەت... تاد گرفتێکیان هەبێت هانا بۆ شـاعیران دەبەن و دەیخـەنە بەردەم هونەرمەندان، یاخود ڕاوێژ بە مـەرجـەعـەکـەیان دەکـەن..؟ دە پێـچـەوانەکـەشی هەروایە! ئیدی بـۆ دەبێت مـەلاکـانمان و سیاسـەتبازەکـانمـان هەم پێشـداوەر و هـەم دەم لە هـەمـوو شـتـێکەوە بژەنن و پەروەردەکردنـی ئازادانەی هونەرمـەندانیش لە ئەسـتۆ بگرن و پێـیـان بڵێن: نەبووە و نابێت فڵان ئەکتـەر و فـیگەر لەم قۆناغـە ناسکەدا ڕۆڵی ئاوا بێت!؟ کەچی دەرەوەی خـۆیان دەبێ هـەر لە دەرەوەبن و بۆیان نەبێت پەل بۆ هیچ شـتێک بهاون کە بۆنی توخن لێهاتنی عەقیدە و ئایدۆلۆژییەتە دەردناکییە کۆمـەڵایەتییەکانی ئەوانی لێ بێت، ئەمە چ دادپەروەرییەکە؟

دەسـەڵاتیش.. لە سـادەترین دەرکـەوتەکانیدا کۆبەند و کۆدەنگی ئیرادەی گشـتی گرووپ و بەرژەوەندییە جیاوازەکانی کۆمـەڵگەیە، لە ڕووی یاساییەوە ناکرێ و شیاو



و گـونجـاو نیـیـە، دوا ڕاسـتی و دوا لێکدانەوە و دوا قـسـە و بڕیار بداتە دەست گـرووپێک و بڵندی بکاتەوە و ئیگۆی گـرووپێکی تریش بهـێنێـتـە خـوارەوە و بە دەرۆزەکەر و مایەپووچ خۆی ببینێتەوە و نابووتی بکات!.

دەسـەڵات دەبێ لە هەوڵ و کۆشـشی ئەوەدا بێت و ئەرکیشی هەر ئەوەیە، کە چۆن چۆنـی ئەو ڕا و بۆچوونە تەبا و.. ناتەبایانەی ناو کـۆمـەڵگە بەڕێوە ببـات. نـەک بە بەهانـەی دروست نەبوونـی سـەرئێشـە و تاکـتـیکی سـیـاسی، لایەنگری لە فـتـوای دانەیەکیان و.. کەنارگیری دەمکوتی ئەوی تریان بکات!.

لەو سۆنگەیەوە ئەو دەسـتدرێژییە نایاساییەی کرایە سەر گرووپی (ئاریا) دەچێتە ئەو مـیـانەوە. (یاسـاش وەختـێک شـەرعـیـەتی هەیە کـە ڕەنگدەرەوە و بەیانکەری- ئیرادەی گشـتی- یاخـود ئیرادەی هاووڵاتیـان بێت، لە پێناو دابینکردن و پاراسـتنی بەرژەوەندییە هاوبەشـەکاندا- ژان ژاک ڕۆسۆ-).

هـەروەها ئەم پێشـێلکارییە دژ بە بنـەمـا سەرەتاییەکانی دیمۆکراسـیـەتیشـە، کە دەسـەڵاتی کوردی حـیـزبەکـان- فـۆرمالیـتـیـیـانە بانگەشـەی دەکـەن. چونکە مـافی ڕادەربڕین و نمایشکردنیشی بەشـێوەیەکی مـەدەنییانە دەشـێ بۆ هەمـوو گرووپەکان وەک یەک و بە هاوبەش هەموار و فـەراهەم بێت و لێی بەهرەمەند بن. نەک جـووتبوون بۆ گـرووپێک حـەڵاڵ و بۆ گـرووپێکی تر حـەرام بێت! ئەم کـارە ناکارایەی دەسـەڵات، گـرووپەکـان دنە دەدات بە گـرژییـەوە لـە بەردەم یەکـتـریدا قـووت ببنەوە و دیواری ئەستووریان لە نێواندا هەڵچنێ و شەرعیەتی حوکمڕانییەکەشی بەم نەزانینە دەخاتە ژێر پرسیار و گومانەوە.

چونکە دەسەڵات دەبێ جووڵەی ئاراستە جیاوازەکانی کۆمەڵ یەک بخات، بۆ ئەوەی بە ڕێگەیەکدا بڕۆن کە لەسەر ڕەزامەندی هەمووان بێت و بۆ بەرژەوەندی هەمووانیش بێت. لە هەر جێگایەک (یاسا کۆتایی هات و پێشێل کرا و میزاجی سیاسی- جێی گرتەوە ستەم دەست پێ دەکات لۆک-). سـەیر لەوەدایە هێشتا دراماکە لە سەرەتادا بووە سـتـەمکارانە دەسـتـیـان نایە بینەقـاقـای. بە دەردی ئـەو منداڵە بـەدبەخـتـەی بەسەرهێنرا کە ئیمـانداریکی توندڕەو لە دەستی باوک و دایکی ڕفاند و کوشتی، کە کابرایان گرت و لێیان پرسی ئەو منداڵە بێ گوناهەت بۆچی کوشت. کابرای تاوانبار

گوتی: دەمزانی ئەگەر گەورەبوایە کافر دەردەچوو! دەسەڵات ئەو مافەی بە ڕەسمی ناسی بۆ مەلاکان، بەڵام مافی نمایشکردنی لە گرووپی ئاریا سەندەوە کە هەر خۆی مۆڵەتی پێ دابوو، پێنج بەشیش نمایش کرا.

خودایا.. ئەمە چ مەهزەلەیەکە، بە ناوی ئازادییەوە دەم داخستنمان دەرخوارد دەدرێت؟ بە ڕاست ئەو ئەقڵە پیرانەی دەسەڵات کە دەم لە ئازادییەوە دەدەن گاڵتە بە ئەقڵی ئێمە دەکەن یان خۆیان هەڵدەخەڵەتێنن؟ هابهاوس لە لیبڕالیزمدا دەبێژێ (ئازادی: بە دیاریکراوی بە مانای پەیڕەوکردنی شێوازی ئەقڵانی و کرانەوەیە.. لە پێناو گەیشتن بە ئەقڵ و تێڕامان و هەستی کۆمەڵایەتی! بەبێ وەڵامدانەوە بەم میکانیزمانە هیچ ڕێگەیەک بۆ پێشکەوتنی ئارام و دڵنیایی کۆمەڵگە بوونی نییە).

ئەم دیمۆکراسیەتە ئاخر زەمانەی دەسەڵاتە پیربووەکانی لە مەڕ خۆمان، خۆیانی پێوە بادەدەن و فەزڵ بەسەر دەرودراوسێ و ناوچەکەشدا دەفرۆشن، ئەو نوکتەیەمان بیر دەهێنێتەوە. پیرەژنێک خۆی دەکات بە ماڵی خزمێکیدا کە دەرگای دەرەوەیان پێوە نەدراوە، لە ژوورەوە دەبینێ کیژۆڵەی ماڵەکە لەشی ڕووتە و هیچی لەبەردا نییە.. پیرەژن کە ئەم دیمەنە دەبینێ، یەکەندەرو لێی دەپرسێ ڕۆڵە ئەوە چییە بۆ ئاوا ڕووتی؟ کیژۆڵەش دەڵێت: دایە گیان ڕووت نیم ئەوە جلی ئەفسانەی خۆشەویستییە لەبەرمدایە. پیرەژن کە هەرگیز مێردەکەی بە ڕووتی نەیدیوە، لاسایی کیژۆڵەکە دەکاتەوە و لە ماڵەکەیدا خۆی ڕووت و قووت دەکاتەوە. مێردەکەی دەگەڕێتەوە، کە ژنەکەی بەو جۆرە دەبینێ واقی وڕ دەمێنێ، بۆیە لێی دەپرسێ: ئافرەت ئەوە چییە بۆ وەها ڕووتی..؟ پیرەژنیش لە وەڵامدا دەڵێت: پیاوەکە ڕووت نیم.. ئەوە جلی ئەفسانەی خۆشەویستییە پۆشیومە. پیاوەش دەست دەکات بەپێکەنین و دەڵێت: ئافرەت ئەو جلە ئەفسانەییەت گەلێک لێ جوانە، بەڵام نەدەبوو تۆزێ ئووتووی بکەیت!؟ دەسەڵاتە خڵەفاو و ئەقڵ چرچ بووەکانی ئێمەش کە خۆیان بە جلی ئەفسانەی مۆدێرن داپۆشیوە ناکرێ تۆزێ ئەقڵیان ئووتوو بکەن..؟

## بۆ ئەوەی نەمریت، هەمیشە موسافیر بە

**– ئەنوەری ڕەشی عەولا کێیە؛ دەتوانی برێک لەسەر شوێنی لەدایکبوون و منداڵی خۆت بۆ خوێنەران بدوێی؟**

– هاوشێوەبوونێکی فرەوان هەیە لە نێوان منداڵی من و منداڵانی – درشتە کولتوورەکەی– کە هەموومانی لە وردە کولتووره – جیاوازەکانماندا.. وەکو یەک فرچک داوە، کە ناوی کۆمەڵی کوردەوارییە.

– لەو ڕووبەرەدا من کێم.. لە ٦– ٢– ١٩٦٣ لە شاری سلێمانی، گەڕەکی سابوونکەران، کە سەر بە گۆیژەیە لە دایک بووم.

وەلێ بە مانا ئۆنتۆلۆژییەکەی.. لە زمانی شۆپنهاوەرەوە دەخوازم بێژم: (سوپاست دەکەم ئەگەر کۆمەکم پێ بکەیت بزانم من کێم)!؟

بەڵێ.. ماجەراکان نیشانی داوین و دەدات، جارێک بەهاکانی ژیان دەمانئاژوێت و، خۆمانمان بە کۆمەڵێ ئاستی جیاجیاوە لێ هەڵدەقوولێنێت. جارێکی دیکەش هێند بە شەوقەوە تراژیدیاکانی ژیان لێ دەخورین، بەو وەهمەی مینا ئاسنێکی سووروەبووی لە کووره دەرهاتوو بیکوتین و بیکوتینەوە؛ بە هیوای ئەوەی کۆمیدیایەک کە دڵ لە ماخۆلیایەکی سەریدا گەرەکێتی لێی دەربهێنین.

لەم گەمە و سەرکێشی و شێتایەتییانەدایە جار هەیە کوشندانە دادەوەشێین.. جاریش هەیە بە غەزەلی ڕوئیاگەلێکی تر دروست دەبین.

بۆ ئەم هەموو جووڵە جووڵە هەرەمەکی و بەرنامەڕێژکراوانەش گا پێمان لە زەمین و گا سەرمان لە ئاسمانێکی بێ پەییدایە. ئەم حاڵەتانەش چەندێک وابەستەی ئیرادە و خواست و هەلومەرجەکانن؟

نیکۆس کازانتزاکیس زۆر ڕوون لە زمانی پاڵەوانێکییەوە دەفەرمووێت:



(خۆم وەکو گەواڵە هەورێک دێتە بەرچاو کە بای کوێستان بە هەموو لایەکدا ڕای ڕفێنێت و شێوەی جیاوازجیاواز وەربگرێت. شی ببێتەوە و دیسان یەک بگرێتەوە، شێوەی باڵندەی قوو، سەگ، شەیتان، دووپشک و مەیموون لە خۆ بگرێت). داخوا ئێمەی ڕاستەقینە، لە نێو ئەم پەرتبوون و جەمبوونانەدا بنەچەکەمان زادەی چین و کێین و بە چ کارلێکێکی پێچی دەدا تێپەڕیوین؟

دەتوانم پێت بڵێم.. کات هەبووە مەیموونەکەی ناو من بەدار و دیواردا هەڵزەنیوە؛ بێ ئەوەی باکی لە هیچ هەبووبێت. بێ خەیاڵ لە هاوار هاواری گەورەکان، یان بێزاری دابونەریت و دەرودراوسێ و خزمان. یان سەگەکەی ناو من حەزی بە نزیکبوونەوەی ئەو سەگە خوێڕیی کراوانە بووە کە توخن کەوتنیان، مانای گلاوبوونی گەیاندووە، ئەمە جگە لەوەی لە ماڵەوە وەک دووپشکە ڕەشە جەزرەبەیان پێ دەگەیاندیت. دواتریش دەبوو بۆ ئوسڵ دەرکردنیش بە گڵە سووره دەست و پلت بشۆردایە و بسمیل بکرایتایە، بە دەم گریان و منگەمنگی سەر خوانی ئێوارە وەختەی خێزانیش دەیانگوتەوە: ئیتر فریشتەش لە ماڵەکەماندا نەما، خوا ڕزقمان دەبڕێت!

بەم دانەسکنان و نەسرەوتنانەشمەوە، هەندێ جاریش مناڵێتیم دەپەرژا.. لە هێمنی یەزدانییانەی نەنکم ڕابمێنم کە لەبەر بەرۆچکەیەکدا نقومی ئارامشیەکی ڕۆحییانەی خۆی ببوو. عارف و سۆفییەکەی ناو منیش چاوی لەو حاڵەتە تاقانەیەی دەکرد و بە دیارییەوە دادەنیشت و ئەو ڕۆژە ئارەزووی چوونە دەرەوە و هەڵماتێن و هەلوکێن و چاوشارکێی نەدەکرد و، ئەمەش بە لای دایکم و باوکمەوە هەم سەیر بوو هەم سەمەرە. بۆیە دەترسان شتێکم لێ قەومابێت، ناچار دەیانگوت: ڕۆڵە کەمێک بچۆ دەرەوە بۆ لای ڕەفیقەکانت. ڕۆژێکی تر سوارچاکەکەی ناو من تینووی سوار بوونی وڵاخ و گوێدرێژ دەبوو.. دەچووین بە دوای باری ئەو دێهاتییانەدا کە چێشتەنگاو ماست و کەرێ و سیرێژ و تۆراخ و بەروبوومی کشتوکاڵییان دەهێنا بۆ شار. ئەو گوێدرێژانەی بە دارتێلەکانەوە بەستبوویانەوە دەمانبرد و حەوت گەڕەکمان پێ دەکرد. درندەکەی ناو من داوای سەری چۆلەکە و ڕاوەماری بن بەردی سەر قەبرانی گردی سەیوان و، چلکەژەنینی لە شارە زەردەواڵە لێ دەکردم . ئیتر ڕۆژ تا

ئێواره ئێمه خەریکی حاڵکردن و شەڕ فرۆشتنێکی بەریئانه بووین بە عەرد و ئاسمان. بێ ئەوەی هەستمان به هیچ دوژمنایەتی و بوغزێک لەگەڵ کەسێکدا کردبێت.

**– منداڵی تۆ چەنده لەگەڵ منداڵانی تر جیاواز بووه؛ ئایا، دەتوانیت لەسەر یادەوەری منداڵیت و دواتر بۆ قۆناغی گەنجێتیت، ئەو کاتەی له کوردستان بووی باس بکەی؛ بەو پێیەی هەموومان وا دەزانین، یادەوەرییان جیاوازه له هەموو کەس و کەس وەک ئێمه پاڵەوانی ناو ڕووداوەکان نەبووه؟**

– وەکو گوتم چ جای هاوشێوەبوون له چوارچێوەی درشته کولتوورێکدا.. هەروەها ناکۆکی و لێکنەچوونێکی زۆریش هەیه که کەسێتییەکان له یەکتر جودا دەکاتەوە، ئەویش له ڕووی پێکهاته و سروشتیان و ورده ڕووداوەکان که پێ دەچێ هەرکەس خۆی شاهیدی یەکەمین بێت بەسەرییەوە. هەندێک لەو ختووره و خەیاڵات و ڕووداوانه به قەولی یۆنگ چوونەته (مەخزەنی ئەسرارەوە) که نائاگاییه. هەندێکی تریشیان ئاگاییمان پەی پێ دەبا و له بارەیانەوە زیاتر دەتوانین بئاخڤین و مانا و ئاماژەگەلێکی لێ هەڵبهێنجین و بخوێنینەوە.

من هەنووکه ناتوانم بچمه سەر ورد و درشتیان، لەبەرئەوەی من ژیاننامەم نانووسمەوە.. ئەوەنده هەیه ئەوەی بووەته ماکی ئێستاکەم. هەموو ئەو فیگەره لێکچوو و جیاواز و یەکتربڕانەی زیندەگیم، یەکەیەکیان پێکهێناوه، که پێی دەڵێن «من». منی کۆمەڵایەتی.. منی شیعری.. منی کوردی.. منی مرۆڤ.. منی شۆڕشگێڕ.. منی ئەفسورده. منی عاشق. منی بێ خەیاڵ.

منێک به خەیاڵ دەستبازی سێکسیم لەگەڵ کچی فیلمی هیندی و کچی دراوسێمان که به منالّی له حەمامی گەڕەک.. بینیبووم و نەموێرابوو نەک توخنی بکەوم بەڵکه سەیرکردنیشی به دزییەوە بوو. شەڕفرۆشتن به کوڕی مامۆستا که له ئێمه سەلارتر و پاک و تەمیزتر و زیرەکتر بوو. کۆکردنەوەی ڕەسم ڕەسمێنەی فیلمی تەرەزان و عەسابه و سوپەرمان و.. تاد. کەچی لەملاوه له هەرزەکاریمدا ئەفلاتوونییانه شەش ساڵ عاشقی کیژۆڵەیەک بووم دوای پێنج ساڵ جورئەتم کرد به



هەناسه گیران و لەش لەرزینەوه ماچی بکەم. له تەمەنی هەڤده ساڵیمەوه بەهۆی عوسمان شەیدای شاعیرەوە که برا گەورەکەم بوو ڕۆحی شاد بێت، کەوتمه ناو گەمەی سیاسەتەوە و هەر به ڕۆحییەته ئەفلاتوونییەکەشەوە، ئاوێزانی ڕۆمانسییەتی شۆڕشگێڕانه ببووم له کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستاندا.. ئەو ڕۆژگاره بۆ من بووژانەوەیەک بوو له کۆمەڵێ ڕووەوه، به تایبەت خوێندنەوه و فزوولیەتی تێگەیشتن له شتەکان بەپێی ئەو ئامرازانەی ئەوکات لەبەر دەستا بوون. بۆ دروستکردنی شوناسێک که گەرم و گوڕییەکانی ئەو دەورانه پێیان دەبەخشیت و لەگەڵ وەهمگەلێک که بۆ ئەو سەردەمه به واقیعیم دەزانین دەست و پەنجەم نەرم دەکرد و، وەکو کەسێکی چەپ به تەعریفاته شەرمنۆکەکانی خۆمەوه ١٩٨٥ چووم بۆ خەباتی شاخ. لەوێ کەوتم بەسەر کۆمەڵێ هەقیقەتی تردا که لەگەڵ فەنتازیا سیاسییەکانی له شارەوه فێری ببووم و لەگەڵ خۆمدا هەڵم گرتبوو، کەوتبوومه ناکۆکییەکی عەجیبەوه.

بەڵام ئەمانه له پرۆسەیەکی دووروودرێژدا بۆ من به کەڵک بوون، ئەویش خوێندنەوەی بەردەوامم بوو. که تۆوەکەی دەگەڕایەوه بۆ منالّیم که له سایەی شەیدای برامدا بوو که کتێبی دەخستە بەردەستم کۆڵێک شاگەشکه دەبووم که نووسەران و هونەرمەندانی ئەو کاته له تەلەفزیۆندا دەمبینین هاموشۆیان دەکردین. له پشووی هاویناندا دەیان ناردمه کن کتێبفرۆشێکی ناسیاومان که ناوی مەحموود خاکی بوو یادی بەخێر.

ئەو دەمانه ڕۆژنامەی برایەتی و بیری نوێ له ڕۆژنامه باوەکان بوون، چ جای له گەنجێتیمدا دەچوومه لای کاک ئەنوەر برزوو کتێبم لەگەڵدا ڕێکدەخست و دەفرۆشت و هەر بابەتێکیشم به گرنگ بزانییبا کتێبم لەو بوارەدا لێ دەخواست.

بۆ یەکەمین جار ١٩٨٣ سێ پارچه شیعرم دایه دەست موحسینی شاسواری که گۆڤارێکی له شاخ دەردەکرد بەناوی (نووسەری چیا) ئۆپۆزیسیۆنێکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو، له دێی چالاوه پیشانی کاک شێرکۆ بێکەسی دابوو، ئەویش ڕەزامەندی بۆ دووانیان کردبوو که بڵاو بکرێنەوه، ئەمه جۆش و خرۆش و متمانەیەکی خۆشی لای من دروست کرد. ئەمه له پاڵ خۆیدا ئەو پرکێشییەی پێ

بەخشیم کە هەندێ پەرەگرافی سادە و ساکاری واهیمەئامێزی لە ڕووی هونەرییەوە کەم خوێن و هەژار لای خۆم ڕەش بکەمەوە . لە دواجاردا هەر ئەو واهیمانەش بوون.. گێنگڵیان پێ دەدام و داوای ڕوونکردنەوەی زیاتریان لێ دەکردم و لە دواجاردا تێگەیشتم ئەمەیە قەدەری من!.

**– چۆن بوو ڕێگەی هەندەرانت گرتەبەر و گیرسایەوە لە فینلاندا، ئایا کۆچی وەکو هەموو ئەو نووسەر و شاعیرانە بوو، کە وڵاتیان بە جێهێشت، یان بڵێین بۆ وڵاتت بە جێهێشت؟**

– من جاری وا هەیە بە قەولی ئوشۆ (باز بدە.. ئەوجا بیری لێ بکەرەوە) چوونە دەرەوەم ئەو بازدانە بێ بەرنامەیە بووە. چونکە چوونم بۆ دەرەوە مەراقێکی جیددیم نەبوو.. گەرچی بە ئازارەکان چەشە ببووم، بەڵام هەستم بە هەراسانییەکیش دەکرد، بەبێ ئەوەی ناوم بۆ لێ بنرێت!

دەبوو ون بم.. جا لە دێرە شیعرێکدا بێت، لە شار و گەڕەک و نیشتمان، نەمدەزانی؟ ئەوەبوو خۆم ون کرد، بە هیمەتی هاوڕێی ئازیزم بەهرۆز حەسەنی وەرگێڕ کە بەڕێوەبەری کتێبخانەی کوردی (پەرتووکە) لە مانگی حەوتی ١٩٩١جوولاین بەرەو سووریا ئەو دەمەی لەوێ بووین، نامیلکەیەکی شیعریم بلاوکردەوە کە بە خەتی هاوڕێم هونەر تۆفیق نووسرایەوە بە ناوی (لە تابووتی دووریيا).. دیارە پێش ئەو بەرهەمە ساڵی ١٩٨٨ کە لە ئێران بووم ئاڵای شۆڕش دوو بەرهەمی تریان بۆ چاپ کردبووم بە ناوی (ڕێزی پرسیار بگرن) و (برووسکە) نووسینی (م. دەروێش عەولا). ئەو دەمەی لە ناو شاریشدا بووم لە گۆڤارە نهێنییەکاندا بە ناوی خوازراوی (ب. سۆلین)ەوە دەمنووسی.

کۆچەکەشم بەرەو تاراوگە وەکو هەموو ئەو نووسەر و شاعیرانە بووە؟ ئەویشیان نازانم، ئەوە هەیە لەگەڵ هیوا قادری شاعیر هاوڕێی ئەو سەر هەڵگرتنە بووین، هەم لە سووریا و لە ڕوسیاش. دواتر ئەو کەوتە سوێد و من فینلاند. بەهرۆز حەسەنی وەرگێڕ و هونەر تۆفیقیش کە سەروکاری لەگەڵ بواری شیعردا هەبوو کەوتنە دانیمارک. ئەمەش نیشانەیەکە کە چوون بەرەو مەنفا هەمووی هەڵبژاردن نەبووە بە



مانای خۆ ڕێکخستن بۆ سەفەرێکی پۆشتە و پەرداخت.. هێندەی سەرهەڵگرتنێک بووە کە هەموو وەخت سەروینی ڕۆشن نین بۆت!.

**– فەزای نووسینی شیعر کەی بوو لە ئاوێزانی شعووری تۆ بوو؟ دەتەوێ بە شیعر بڵێی چی؟**

– کە پشوویەک دەدەیت، خۆت لە بەردەم خۆتدا ڕاتدەگرێت و دەخوازێ لە نهێنی ڕووداوەکانت تێبگات.

ئیدی ئەم سەفەرە ناوەختانەی کە لە ژیانا هەن، دەرهاویشتەی ئەو منە تێکئالۆسکاوەیە، کە بە وردە منەکان ناوی دەبەم.. کە هەر جارەی بەشێوەیەک دەردەکەوێتەوە. پێ دەچێ تۆوێکی ئەو منە مناڵی بێت. غارغارێن بە ئەسپی خەیاڵ.. دەستکردن بە کونی یەقینەکاندا و ورووژاندنیان. بۆ فراژبوون بەپێی حیکمەتی مار لە پاییزەکانی دەروونداکاژی گەڵاکانت دادەماڵیت. ئەوەی لە نێوان من و مناڵیشدا دەمێنێتەوە تەنها هەڵبژاردنەکانە! واتە ڕۆشنکردنەوەی ئەوەی چاوەڕێی ڕۆشنبوونەوەیە. بالاڕۆیی ئەوەی دەبێ بالا بکات لە وەرزی خۆیدا و سووسەکردن بۆ ڕامکرنی لەحەزەی ئەو وەرزە سرکانە. وەک یەک لێکردنی دەرەوە و ناوەوەم! چۆن فەنتازیا لاسار و نەسرەوتەکانی مناڵی ئاوێتە بە خەونەکانی هەراشبوون دەبن. چۆن بە ماڵئاوایی خورپەو خولیاکانی مناڵی پێشوازی.. لە خورپە و خولیاکانی گەورەیییەک بکەم کە ئالوودەی لۆژیک و ئەقڵانییەت و ئایدۆلۆژیا و ئەمر و نەهییەکانی ترە و بە یەکتر ئاشنایان بکەمەوە.

چۆن دیمەنە کۆمیدیی و پێکەنینهێنەرەکانی مناڵی.. دڵی تراژیدیا و گرژی و مۆنییەکانی گەورەیی بداتەوە.

کە ئێستا گەورەبوون زۆرجار و ڕادەبەدەر بە خۆی نامۆ دەبێ و هەڵوەدای سیحر و موعجیزەیەکی مناڵیی ڕزگاری بکات و دەست بداتەوە باڵی شکستەکانی و هیدایەتی بکات بۆ تێهەڵچوونەوە.

بەڵێ.. ئەو ساتەوەختەی کە شعوور دەکەیت مانەوە لە نیشتمان هەرەسهێنانێک دەبێ لە ناوەوە و، حەکایەتە گەورەکان وەڵام بە ماخۆلیاکانت نادەنەوە و تۆ

ڕووبەڕووی کۆمەڵێ پرسیار و گومان دەبیتەوە و نەغمەیەکی تر لە هەناوت دەبیستی کە بۆنی تەنیاییەکانی خۆتی لێ دێت و هەر خۆشت شاهیدێکی ڕاستەقینەی ئەو حاڵەتەیت. ئیدی ئەمە نەعلەتێکە و نابینای بگریت دەتکرۆژێ و دڵت بە هیچ شتێک خۆش نابێت و بەرەو پووکانەوە و نەزۆکی ڕۆحیت دەبات. ئیدی دڵت لە تاڵێ مووی باریکتر دەبێ و بەرگەی هیچ ناپاکییەکی تر ناگریت و دەترسێی تۆش بکەویتە ئەو گەمانەوە کە هی دونیای تۆ نین، هیواکانت ئیفلیج و ڕۆحی سەوزت بەرەو وشکبوونەوە دەبەن. خۆت لەوە بێهێزتر دەبینی کە ئیتر بە موعجیزەی شۆڕشگێڕانە دنیا بگۆڕێت. ئەمجارە وەکو دۆڕاوێک.. بریندارێک.. بە ویژدانێک.. شاعیرێک.. نازانم چ ناوێک بنێم، دەبێ لەو گەڕەلاوژەیەدا کە زۆربە بە دروشمبازییەکان و بەڵێن و مژدەکانی سەرمەستن و نازانن چی لە ژێر پێستی کۆمەڵگەدا دێت و دەچێت. هێمنتر، بێ خەیاڵ لە هەر ناووناتۆرەیەکی فەرهەنگی پواوی سیاسەتبازەکان، لەسەر هەڵپە کردنەکانی گەنجێتی ڕابووەستیتەوە و بوارێک بدەیت بە خۆت کە چی گوزەراوە.. بۆ ئاوها گوزەرا و بەشێوەیەکی تر نەبوو. ئایا دەبوو ئەو کارانەم بکردایە کە کردم.. چەندێکی پەیوەندی بە ئیرادەی پڕ شکۆمەندانەی خۆمەوە هەبوو.. من لە خشتەبرابووم و دوای کڵاوی بابردوو کەوتبووم یان لێپرسراوییەتێکی ویژدانی و ئەخلاقی بوو و دەبوو ئیلتزامم پێوەی هەبوایە. ئەمانە چەندێک لە جیهانە تایبەتییەکەی خۆم دەریکێشام یان کۆمەکی پێ کردم. ئەم هەڵۆەدا بوونانە چ گۆڕانکارییەکی بەفەڕیان بەسەر مندا هێنا و ئەو بەهایانە چی بوون کە لە بزاوتە نەتەوەییەکەدا ون دەبوون و نە دەبینران.. خۆ بوون وەکو نەتەوە و خۆبوون وەکو فەرد لە کوێدا بە یەکتری دەگەن و لە کوێدا جودا دەبنەوە؟ بەڵێ.. ئەم دڵەڕاوکێ فیکری و وجودییانە خستمیانە جووڵە بەرەو میتۆدگەلێک کە گفتوگۆی سیستماتیکانەتر لەگەڵ خۆم دابمەزرێنم. چونکە من بە هەر هاژە و هوژێکەوە شاعیرانە لە دنیام دەڕوانی.. بەو ئەزموون کردنانەش. خەیاڵ و زمانی شیعرییانەم پاراوتر و خاراوتر بە کۆمەڵێ ڕەهەندی تر بارگاوی ببوون و بە متمانەیەکی زۆرترەوە لەسەر پێی خۆم دەوەستام. هەستم دەکرد بە ئازاد بوونم شیعریشم ڕوخسارێکی تر وەردەگرێت.. کە لە نەریت و ڕەمەکییەتی خۆیەوە خۆی شێوەباز دەکرد. ئەم



دەرککردنەش تێکستە شیعرییەکانن پێت دەڵێن. نەک پێشوەختە بە (دەزگای فیکری) بڕیارت دابێت چی بنووسیت و چۆن بنووسیت و بۆ کێ بنووسیت! زۆر سادە شیعر بە سەرفیرازییەک کە لە بوونیدا هەیە. ملکەچی ئەو جەبرانە نابێت، کە لەدەرەوەی خۆیدایە. بەڵکو تەنها گوێڕایەڵی بڵندبوونەوەیەکە کە لە ناوەوەیدا ئازادییەکەی هەڵی دەچنێت و بەس!

ئەم مۆتیڤانەش کە شاعیر پێویستی پێیەتی بۆ بەرقەرارکردنی (دینامیکییەتی فەنتازیای بیرکردنەوە و بیرکردنەوەی فەنتازیاکانی) کە میکانیزمێکن بەها ئیستاتیکییەکانی خۆی پێ دەخوڵقێنێ. ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ دەستیان هەبوو کە لە سۆراغی جێگایەکدا بم بۆ چاککردن و تەواوکردن و سەرپێخستن و بەردەوامی ئەم وەسوەسە ڕەنگاوڕەنگانەی خۆم.

دەستە یەزدانییەکانی شیعر ڕادەمووسم، (کە لە هەوڵی ناسین و تەواوکردنی کەموکوڕییە کەینونییەکانمدا لە نیگەرانییەکانم نەپرینگایەوە و بە میهرەبانییەکانی ناچاری کردم مانای تر و دەنگ و ڕەنگ و بۆی جادوویەکی تر بە ژیان ببەخشم و بدۆزمەوە و، هەستکردن بە نامۆییەکانم تیا برەوێنێتەوە و بەرەو پەیبردن بە نهێنییەکانی بوونم بەرێت و، بڵێت: ها.. جوانی لەم سەفەرە پڕ ڕیسکانەدایە کە تەنیا دەیکەیت، جا بۆ ئەوەی نەمریت هەمیشە موسافیر بە!)

**– نەغمەیەک کە لە دنیای شیعری تۆدا هەست پێ دەکەین، هاوارێکی وجودییانەی خۆتە، لە بەرامبەر دنیا، دنیایەک، کە بێ خواستی خۆمان لە باوەشیان هاویشتین.**

– ژیان.. بە تەپ و تۆز و قوڕ و لیتەی ئەو گومانانەی لە کۆڵانەکانی بوونەوە بەپێڵاوەکانییەوە دەیهێنێ بۆ سەر ڕایەخی ڕۆحمان، هەر خانەخوێیەکی ڕەزاسووک و خوێن شیرینە، بۆ ئێمەی مرۆڤ.. ئێمەی کرێچی!

خوا دەکات تا ئەو کاتەی مردن بە هاوارێک خواست و خەیاڵێکی بزێوم دەردەکاتە دەرەوە لە ماڵی خۆی.. ژیان بە خانەدانی خۆیەوە لەسەر جێگەیەکی کە لەوانەیە (دڵۆپە ئاوی بارانێکی بێت.. یان بزەی کیژۆڵەیەک بێت لە کاتی تەنیایی مەنفادا ، یان ژێرباڵی پەپوولەیەکی شڕشێت، کە بێ خەتا خۆی لە گڕی عەشقێک ئاڵاندووە)

دالّەی خەونە هەتیوەکانم دەدات.

پێی دەڵێم: گەورەم سوپاس.. بۆ ئەو هەموو ئەڵماسی دڵۆپانە کە لە گەنجینەی هەورە کریستاڵییەکانتەوە بەسەر منی گەدادا ڕژاندت.

سوپاس.. دەمناسێنیت بە سیحری بزەی ئەو کیژۆڵەیەی، تەنیاییم دەمێکە لە چاوەڕوانیدایە بۆی.

سوپاس.. بۆ نیشاندانی ئەو هەموو نامە و وێنە نەبینراوانەی لە ژێر باڵی پەپوولەیەکی عاشقدا بوون و نەدەبینران.

سوپاس ئەی ژیانی زمانزاڵ کە بە شەهامەتێکەوە پێم دەڵێیتەوە، شیعریش: تەنێ گوزارشتێکە لە بیرکردنەوەیەکی من.. کە دەربارەی خۆم دەیدەم!

هاوڕێم.. مناڵێتییەکەی ژیان، هەرزەکارییەکەی ژیان.. پیرییەکەی ژیان جوانە، چونکە هەموو ساتێکی موعەممای تیا دەزێ.

موعەمما.. یەعنی ڕەشنووسی سەفەرێکی تر، ئاوڕدانەوەیەکی تر، بینینێکی تر، پرسیار و گومان و تووڕەبوون و پێکەنین و گریانێکی تر!

– تا چەند تۆ قەلەقی، ئایا تۆ پیاوێکی قەلەق نیت، لە ژیان و بیرکردنەوە و تێڕامانەکانت، قەلەقی بە مانا مەعریفییەکەی، ئایا تا چەند توانیوتە، ئەم قەلەقییە ئەبستمۆلۆژییانە، لە چوارچێوەی شیعردا پێناسە بکەیت؟

مادام مرۆڤ دڵی بۆ جیلوەی جوانییەک لێ دەدات کە هەست دەکات لە ژێر پێستی عەدەمدا دێت و دەچێت و، چاوەڕێی دەستی بیرکردنەوەیەکە بیگاتێ. گوێی شیعرێکە بیبیستێ. گومانێکە بۆنی بکات. ژیانێکە تامی بکات. تێڕامانێکە بیبینێ. ناتوانێ قەلەق نەبێت. ئەوەی هێڵێک لە نێوان شیعر و ژانرەکانی تر و دونیای فیکریشدا دەکێشێت، پێم وایە.. قەلەقی زمان بێت لە بەرامبەر ماناکانی خۆیدا. واتا یاخیبوون لە بەرامبەر بە مانا بە دامەزراوبووەکاندا. ئەوەی ئەم شەڕەش بەڕێوە دەبات شاعیرانن. ئەوەتا کۆمەکی عارفەکان دەکەن هەتا لە پەرت و بڵاوی وێنەکان دڕدۆنگ دەبن! شێوازەکانی وردبوونەوە و ڕوونبوونەوە دەنێنە پێش دەمی توێکارییەکانی



زانایان، هەتا تێبگەن: وەهم و هەقیقەت.. ئەقڵ و دڵی جەستەیەکن. وەلێ ناشتوانن، ئەم ڕاستییە سەرابییە؛ بۆ خۆشیان بسەلمێنن. بە فەرمانڕەواکان دەبێژن: سواری ئەسپەشێی لە خۆباییبوونەکانی خۆشتان بن. هێشتا ئەندێشەتان ناگاتە پەیامگەلی – با– یەکی بێ خەیاڵ، کە بە هەموو لایەکدا ڕادەکات و ڕادەگات و لەپەسا تازەیشی لێ دەچۆڕێ. وەکو گومانکارێکیش، پێش هەرکەس دەکەوێتە وێزەی زمانی خۆی و بەڵگە نەویستەکانی لێ دەستێنێ و، بێ برانەوە لە سیفاتی سرکی بەها ڕاچەنیوەکانی تیادەچێنێ. ڕەگ و ڕیشەی بێدەربەستی زمان دەهێنێتەوە سەر خوانی بێدەربەستی شیعر و پێیان دەبێژێت: تا ئەو حەلە؛ گوێڕایەڵی خۆتان بن..کە لێوڕێژ دەبن لە ماجەرا جیوەیی و، لە بێدەربەستی قەناعەتەکانی ژیان! ئەگەر شیعر ڕەنگڕێژ بێت، بە نموونەیەکی باڵا؛ کە هەڵگری: سیفاتی.. سروشتی.. ئیرادەی.. ئەندێشەی.. بنەماکانی.. سەربەخۆیی ژیان بێت. ئیدی چێکردنی ئەو ماڵە بە دەستی قەلەقییە ئیستاتیکییەکانی شاعیر لەگەڵ خۆیدا، مافی خۆیەتی.

لێرەوەیە.. شیعر دوورە لە نەخشە و نیگارەکانی ئەبستمۆلۆژیاوە. کاری بە پرسیاری قوتابخانە مەعریفی و فەلسەفی و ئاینییەکانەوە نییە و بە کێشەی ڕاستەقینەی خۆی نازانێ و گوێڕایەڵ و فەرمانبەرو جەنگاوەری ئەو بوارانە نییە!

هەستان بەو کارەش دژ بە سروشتی شیعرە و، زیان بە کەسێتی و ماهیەتی شیعر دەگەیەنێت و دەیشێوێنێ.

شاعیریش پروپاگەندەیەکی نییە، بەڵکو لە ڕێگەی سەربەستی و سەربەخۆیی ئەدەبەوە، بۆ گوزارشت و سەرفیرازیی بیرکردنەوەکانی خۆی دەگەڕێت و لەوێدا هەڵیدەگرێتەوە.

لە زمانی ئایریس مێردۆکەوە (با نەکەوینەوە هەمان ئەو غەفڵەتەوە کە کۆمۆنیستەکان دەیانکرد و، تەنها ڕۆڵی دیاریکراوی هونەریان لەوەدا دەبینی؛ کە ناچاری بکەن، ببێتە ئامرازی شۆڕشی کۆمەڵایەتی) یان ناسیۆنالیزم و، ئیگزیستێنیالیزم.. تاد

شیعر.. دەشێ ئامانجی گەیشتن بێت بە تخووب و تەکامولکردنی جوانییە ڕەمەکییەکانی خۆی نەک کۆمەڵگە.

که ئەمەی پەی پێ برد و لەدەست هات، ئەوجا بۆنی قووڵاییە ئیستاتیکییەکانی خۆی و ژیان و هەقیقەتی لێ دێت و ، هەر ئەمەشە لێپرسراوییەتی ئەدەب.

که دەڵێین شیعر خەریکی خۆپەسەندییە درەوشاوەکانی دونیای خۆیەتی. بەو مانایە نایەت، بەهای هیچ یەکێک لەو بوارانە لەگەڵ یەکتری بە کەم و زیاد بزانێت. ئەوەی هەیە شیعر بە شەهوەت و هەستەکانی خۆیەوە پەیوەستە و، بە ئەقڵ و دڵی خۆی هەڵدەبژێرێت و لە ڕەهەندێکی ترەوە کە بۆ ڕیسکە ئیستاتیکییەکانی پەسەندە، ئەو ژانرانە لە ناوەندی ماناکانی خۆی، هەڵدەکەنێ و دەپەڕێنێتەوە و، لە مەودایەکی تردا تێکەڵ بە پراکتیکی دونیا و یاسا ناوەکییەکانی خۆی دەکاتەوە و توێکڵی بەرائەتیان لێ دادەماڵێ و لەناو وزەی جیهانبینی و و بەرتاوی هێماکانی خۆیدا دەیانبووژێنێتەوە.

گەر ئاوڕێکی کورت بدەینەوە.. ئەوکاریگەرییەش بە دیوە پێچەوانەکەشی دەبینینەوە.

بڕوانە.. گرێی ئۆدیب سەر بە تێکستێکی ئەدەبی بووە، کەچی ئەمێستاکە بووەتە چەمکێکی سایکۆلۆژی.

ئەمەش پێمان دەڵێت، پێدانەوە و وەرگرتنی ئەو مافەش بۆ شیعریش هەر ڕەوایە.

بە تایبەت بۆ بەدواچوون و دۆزینەوەی ئەو پانتاییە بزربوو و نەناسراوانەی دەستیان لە بڵندبوونی بنیاتی ئەودا هەیە و فرسەتی هەڵکۆڵینی وەهم و گومانەکانی کارسازتر و خاراوتر دەکەن.

بۆی هەیە بۆنی بەرامەی گوڵستانی فەلسەفەیەک بکات کە پڕن لە گوڵی سەیر و سەمەرە. یان پەنجە لە پێستی مەعریفەیەکەوە بدات کە پێی وایە پڕە لە تەڕی ژیان. گوێی لە تەپەی دڵی ئیمان بگرێت کە بەدیار یەقین و سیحری جوانییەکەوە داسەکناوە و سەری نەشئە و ڕۆحی مەستە پێی. ئەمانە کەرەسەگەلێکن سەرکێشییەکانی فیکری زمان و خەیاڵی زمان، بۆ چاککردن و نوێکردنەوەی ئاکارە شیعرییەکانی خۆی دەستیان بۆ دەبات و پێویستی بە یۆتۆبیاکەیانە.

وەک چۆن شیعر بارگاوییە بە خەیاڵ و فەنتازیا، بارگاویشە بە فیکرو فەلسەفە و فیگەرەکانی تری ژیان و بوون.



بەڵام هەموو ئەو ڕەگەزانە لە شیعردا بەهایەکی تر وەردەگرنەوە، کە بەهای شیعرین و بەس! بۆ نموونە دەکارین بێژین:

(لە مەعریفەیەکی ئەقڵییەوە دەیانگۆڕێتە مەعریفەیەکی زەوقی- ئەدۆنیس-)

ڕوونتر.. کە دەبینین تێکستێکی شیعری بەلای وەسوەسەکانی بوونخوازیدا دەچێت، ناکرێ وەها زەن بکەین، دەخوازێ قسەی هایدگەر و کیرکگارد و سارتەر دووبارە بکاتەوە؛ نا! یان خۆی لە جەدەلەکانی شۆبنهاوەر و نیچە و هیگڵ و کانت هەڵدەقورتێنێت؛ بە گیانە جادووییەکەی شیعر.. ئەمیشیان نییە!

زۆرسادە لەبەرئەوەی شیعریش وەک هەر بوونەوەرێکی تری هەبوون.. بوونی خۆی دەژی. لەگەڵ تەنگژەو ئازادییە دەروونی و وجودییەکانی خۆیدا، قسەی هەیە بۆ گوتن، کە لە قسەی کەس و هیچ بوارێک ناچێ.

بەڵام پێ دەچێ لە بەدواچوونەکانیدا نزیکایەتیشی لەگەڵ ئەم میتۆد و ئەو قوتابخانەی فیکرییانەدا بۆ دروست ببێت و بەریەککەوتن ڕوویدات بێ ئەوەی لە بەرنامەیدا بووبێت ئەم کارە ئەنجام بدات، بەڵکو خود بە خود لە سەفەرە خۆڕسکەکانیدا.. ئەوانیش دەبنە بەشێک لە تێشووەکەی!

کورت و پوخت، پێ دەچێ جیاوازییەکە لەوەدا ببینین..

ئەبستمۆلۆژیا: بەرەو دڵنیایی وێنەکان و چوارچێوەی زانین و پێناسەی هەقیقەت دەچێت و بەرەو بنیاتنانی ماناکانی بەرەوڕووە.

کەچی هەقیقەتی شیعر.. نادڵنیایی و ناپەسەندی و نەزانینی دوافۆرمێکە، ئەگەر بمانەوێ بە تۆپزی و پێودانگی لۆژیک و زانستێک بەباڵای ئامازەکانی ژیان و مردن و تەنیایی و بووندا دایببڕین، لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی ماناکانیاندایە.

ئەبستمۆلۆژیا: لە ڕووی فسیۆلۆژییەوە، ئەو چالاکییانەیە کە وزە لای چەپی دەماغەوە وەردەگرێت، بۆ سەلماندنی بەڵگە و لۆژیکی ئارگۆمێنتەکانی. کەچی شیعر ڕوانینە فەنتازیاکانی، سەر بە چالاکییەکانی ڕاستی دەماغەوەیە.

بەو دەستەواژەیە

ئەبستمۆلۆژیا: فرزەندی لۆگۆسە و شیعر فرزەندی میتۆس!

گەرچی لای ئەفلاتون، کە بە دڵڕەقترین فەیلەسوف دادەنرێ دەرهەق بە هونەر و،

بە تایبەتی شیعر بڕوای وابووە (هونەر نەزم و لاوەکییە و.. مەعریفەش ئەقڵی و گشتییە).

کەچی لەلای شۆبنهاوەر (هونەر بەدوای ئایدیاکاندا دەگەڕێت و دەیانگوێزێتەوە، ئایدیاکانیش بە کۆمەڵێ فۆرمی مەعقوول دەزانێت، کە هەندێکیان لە سروشتدا دێنە دی و لە بەرگی ڕاستیدا بەرجەستە دەبن. هونەرمەندیش لە ڕێگەی هێزی خەیاڵەوە؛ دەریان دەهێنێ. چونکە هونەر تائەوپەڕی سوود لە هێزە ئەقڵی و ئاکارییەکان دەبینێ و هونەر دەبێتە تەقەللایەک بۆ زاڵبوون بەسەر دەروون و بینینی جیهاندا).

خەیاڵی شاعیر لەو نێوەدا، بەبزاوتی ئەو هەنگە دەچێت کە لە هەلاڵەی هەموو گوڵە جوداکان، هەنگوینی خودی خۆی ئافەریدە دەکات. ئیدی ئالێرەدا ئەو هەنگوینە؛ تەنها لە ڕۆحی یەک گوڵ نییە و، بەڵکو ئاوێتە و کارلێکێکی ئاڵۆزی ڕۆحی هەموو گوڵەکان و هەنگەکەشە.

لە گۆڤاری زناردا بڵاو کراوەتەوە

# نووسەر و مەنفا

نیشتمان و مەنفا، لە مەودای جیاجیادا.. یەک ئەوەی تر جوانتر و ناشرینتر دەکات، لە پێش چاوی کەسی مەنفانشیندا.

کەچی هەردووکیان وەکو ئاسمان و باڵندەش وەهان بۆ ژیاندنەوەی چیرۆکەکانی یەکدی. یان دەکارن هەردووکیان دڵ و ئەقڵی یەکدی بن.

چونکە لە قووڵاییپاندا مەنفا و نیشتمان لە حاند گەوهەریاندا بێگانە نین بەیەکدی.

مەنفا و نیشتمان دەتوانن دوو باڵی دەردگەلێکیش بن، لە هەڵفڕینیاندا فێڵ لە چاو و دەروونی مەنفانشینیشی پێ بکەنەوە.

وەلێ جیاوازییەکەیان لەوەدایە: دەردێک شلڕەوە، دەردێک توندڕەوە. دەردێک سەر کزکردووە، یەکێک سەر بەرزکردووە. یەکێک لاسارە، یەکێک دەستەمۆ بووە!

بەڵێ تەنێ جیاوازییەکەیان لەوەدایە: لە نیشتمان؛ مەنفانشین زیاتر دەردی – ئەوی تر– ئەزموون دەکات – واتە– بە خەمە کۆلێکتیڤیەکان ڕووبەڕووە و گیری کردووە.

لە مەنفادا زیاتر دەردی – خۆی– ئەزموون دەکات – واتە– بە خەمە ئیندیڤیدواڵیەکان ڕووبەڕووە.

لە نیشتمان مەنفانشین، زیاتر ئیفرازی دەردی ڕابردووە.

لە مەنفادا، مەنفانشین، زیاتر ئیفرازی دەردی ئێستایە.

پوختە: بۆ من مەنفا گەمە و فریوێکە، جارێک لە هەقیقەتەوە وەهم بۆ داستانەکانی خۆی دەگوێزێتەوە. جارێک لە وەهمەوە هەقیقەت بۆ خۆی دەگوێزێتەوە.

خەڵات و سزایەکیشە. نیشتمان لە دووری دوورەوە دەیبەخشێتە ئەو فرزەندانەی، لە ئاستێکدا بوێرییان نواندووە و یاخی بوون!

تیکە تیکەکردنی ئەو فرزەندانەشیەتی بە دانەچیرەوەکانی بەرزەخێک کە لە نێوان



شەویلاگەی نیشتمان و مەنفادا دەیانجنێ!

لەو مەحشەرەدایە.. مەرزی نێوان گوناهباری و بێ گوناهی.. چاکە و خراپە.. کرانەوە و داخران هێند بەیەکدا دەچن و وەها لێک هەڵدەپێکرێن. لێت تێکدەچێ لەم سیانە: نیشتمان و مەنفا و مەنفانشین، کێیان گوناهبار و خراپ و داخراون!

دەشێ سەفەر و ڕیسکەکان بۆ هەموو مرۆڤێک مافێکی پێویست بێت. تەنانەت ئەگەر بۆ تاقیکردنەوەیەکی سەرچڵانەش بێت.

بەڵام کێشەکە لەوەدایە مەنفانشین هەمیشە هەموو پارچە پارچەبوونەکانی خۆی لە نێو ڕووداوە جیاوازەکاندا بۆ کۆ ناکرێتەوە. بۆیە ئەگەر لە جێیەکیاندا گوێکانی ببووژێنەوە، لە کاتێکدایە ئاوی چاوی وشکایی داهاتووە.

دەشێ.. پەنجە و پێیەکانی – ئیرادە– هەستیار بووبن بە خۆیان، لە کاتێکدا ڕێگە و – هێزی– ئەو تاسەبارییەی ڕێگەکان لێی دەخوازن بۆ سەفەرێکی بەردەوام و گەیشتن بە دوورگەی بەختەوەرییەکەی، تەوژمەکانی دامرکابێتنەوە و کاتی ناکات و هەڵگری کۆڵی ئەو بارە نەبێت.

پێ دەچێ.. لەگەڵ ئارەزووە چەپێنراوەکانیدا بە دیداری یەکدی شاد ببنەوە، لە کاتێکدا تام و چێژەکانی بن زمان؛ بە بێ خواستی خۆت لێت تۆرێنراون! چونکە ئەو زەمەن و شوێنەی کە حەزەکەی تیا سەرکۆنە کراوە لە نیشتماندا، لە مەنفادا ئیدی درەنگە قەرەبووی خۆی بە دڵی خۆی بکاتەوە، لە فەنتازیادا نەبێت!

لەبەرئەوەی تەنێ لە فەنتازیادایە دەتوانی زنجیرەکانی کات و شوێن، لە چاوەکان و پێیەکان و باڵەکانی خەیاڵت دابماڵیت!! گوناهی مەنفاش نییە قەرەبووی ئەو یادگارییە تاڵ و شیرینانەی بۆ ناکرێتەوە، کە پڕبوون لە ڕاستگۆیی دڵڕەقانە و دڵنەرمانەی ڕۆژگارێک کە دوور لە خواستی ئێمە هەنگاوەکانیان ناوە.

بەڵێ مەنفا دەتوانێ؛ هەر نزرگەیەکی تری ئاوابوون و هەڵاتنی ڕاز و تامەزرۆییە تازە و دێرینەکان بێت، کە بارگرانن بە تابووتەکانی یادەوەریمان.

ئایا لە مەنفادا.. زەمەن پێودانگەکانی خۆی وەلادەنێت و دەکەوێتە پاشەکشە لە

لۆژیکەکانی و ڕێبازەکانی کە لەگەڵ عومریدا گرتوویەتە بەر بە ئاسانی دەقڵەشێن لە پێش خواست و ئاواتی مەنفانشیندا بۆ هاتنە پێشی هەڵکەوتی تر، کە بە زمانی بوێریی و جەربەزەییەکانی هیچ ئاشنا نییە؟ ئایا دەنگە نارِوون و دوورەدەستەکانی ڕابردوو، بەپێدزکەش بێت، تێکەڵ بە دەنگی ئەمێستا بێ شوناسەکەی مەنفانشین نابنەوە؟ ڕاستە لە تەڵەزگەکانی ئازارگەلێک دەرباز دەبین. وەلێ بە نهێنی وەهمێکی تاقی نەکراوەی ترەوە ئالوودە دەبین و دەگەوزێینەوە.

بۆ مەنفانشین سنووری نێوان جەستە و دەروونی دووری و نزیکییەکان هێند چاودێری هەنگاوی تەمەنناکانی یەکدی دەکەن، لەسەر هەڵبڕینیاندا دەبینن بوون بە یەکێک! ئەبەدییەت و هەنووکەییبوون دەبنە مامان و گۆڕهەڵکەنی مەحاڵەکانی یەکتر.

مەنفاش وەک هەر نومایشێکی تری - بوون- لە نێو تارمایی ئەمدیو و ئەودیوی دەروازەکانیدا بە دەستێکی زەندەقمان دەبات و بە دەستەکەی تریشی زەنگی زیندەگیش دەزرنگێنێتەوە! لەوێدایە بەو زمانی ئارسەر ڕامبۆی موسافیر زیاتر ئاشنا دەبینەوە کە دەیگوت: ژیان شەڕەشەقێکە لە هەر جێیەک بێت دەبێ بیکەین.

مەنفا بە گوڵی خاشخاش دەچێت، هەتا لێی بگیرێتەوە کارگەرتر دەبێت.

ئەلکترۆنێکە هەتا وردتر کرێتەوە تەقاندنەوەی ئەتۆمەکانی کاریگەرتر دەبێت.

ئەم گیرۆدەبوونانەش بە دەرهێنانەوەی مانا شاراوەکانی هەناوی مەنفا، بەو کەسە دەچێت لە چاڵێکدا هەتا ژێر خۆی هەڵیبکۆڵی قووڵتر دادەچێ!

لەم هەڵگەڕان و داگەڕانەدایە مەنفا ئاوێتە بە مەجازی ژیان دەبێت.

تەقەللاکردنیش بۆ پێناسەکردن و چوارچێوە دانێک بۆ بزێوییەکانی ئەو مەجازە سرکانەش بێهوودەییەکی ترە. تەنها دەبێتە خۆراکدەر و ناندێنی بیرکردنەوە و فەنتازیای نووسەر و بەس! ڕاستە لە بن تاوێر و زنارەکانیدا گوێبیستی هاژە و هوژی هەڵقووڵانێک دەبین. بەڵام بەو ئیحایانەشی کە دەیبەخشێت، نەک بەتاڵ نابێتەوە و ناگا بە پایانی خۆی. بەڵکو بە بەخششەکانی هەراوتر و پڕتر دەبن بە نادیاری و نەناسراویی تر! نووسەران ئەوەیان بۆ دەمێنێتەوە (لە دژوارترین ڕێگەی خۆی سەربکەوێ و، تەنیاترین ئاوارەیی خۆی دەست پێ بکات- نیچە-) کە نەترسان



و بە مەترسی نەگرتنی ئەو وێنە نەزانراو و نەناسراوانەی مەنفان.

لەبەرئەوەی مەنفا لە هەناسەکانمان.. هاموشۆی خوێنی بەدەنمان نزیکترە بۆمان.

ئەرێ لە دایکبوون.. یەکەم هەنگاو نییە بۆ مەنفایەکی نەناسراو (کە ناوی ژیانە)!؟

دەشێ مەرگیش مەنفایەکی تر بێت؟! کاری نووسەران پێ دەچێ، تەنها گۆڕینەوەی قەڵای مەنفایەک بێت بە دالانی مەنفایەکی تر. مەنفا وەکو ئاو و ئاگر و با هەستیان پێ دەکەیت، بەڵام چنگێکت بۆ نابرێت.. ناتوانی چەپکیان بکەیت. تەنها ئەوە نەبێت. لە نێو ئەو مەنفا ڕەنگاوڕەنگانەی بووندا، سروشتی زمانیان فێر ببین و بیانهێنینە قسە.

ئایا نووسین بۆ خۆی مەنفایەکی تری نووسەران نییە؟ کە نیچە پێی وایە (مانادان بە چوار وشەی بێ مانا.. وەکو سافکردنی شاخێک وەهایە بە سمارتە).

نووسەران لەم چوونە ناوەوە و هاتنە دەرەوەیدا، لەم گەیشتن و نەگەیشتنانەیاندا دەگێژەوە دەچن. مەگەر بە تەلیسمێکی تری تێکستەکان خۆڕاگرییەک وەدەست بێنێ و، ئەو مانا نوێیانەی کە دەیدات بە مەنفاکەی لەنگەری پێ بگرێتەوە.

بەڵام ئەزموونەکان نیشانی داوین: بەرزاییەکانی مەنفا چەند بەرزیش بن بەرزی خۆت نین! بەڵام نزمییەکان نیشتمان چەند نزمیش بن هی خۆتن!

پێ دەچێ مەنفاش لە دواجاردا بە نووسەران بڵێت: من دەتوانم هەموو شتێک بم و هیچیش نەبم! ئەوە خۆتان و بینین و لێکدانەوە و تەئەمولاتەکانی خۆتانە، ئەم هاوسەنگییە ڕادەگرێت، یان تێکی دەداتەوە! ئەوە هەیە (ئەم کۆڵانە درێژەی کە بۆ دواوە دەچێ و هەتا ئەبەد دەخایەنێ و، ئەو کۆڵانە درێژەی کە بۆ پێشەوە دەچێ ئەبەدییەتێکی دیکەیە- نیچە-) نووسەران قەدەریانە، لە نێو ئەو ساتانەدا هەر غەریبانە دەبێ بێن و بچن!.

لە ڕۆژنامەی ڕۆژنامەدا بڵاو کراوەتەوە

# ناوەڕۆک